خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

• ڕاگەیاندن و هۆشیاریی سیاسی

• ئەرشەد خەلیل شوانی

• سەرپەرشتی: د. حەبیب کەرکووکی

• نەخشەسازی ناوەوە: ڕێدار جەعفەر

• بەرگ: ئەبو بەکر عەبدوڵڵا

• نرخ: (٣٠٠٠) دینار

• چاپی یەکەم : ٢٠١٤

• تیراژ: ٧٥٠ دانە

• چاپخانە: موکریانی (هەولێر)

• لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٣٢)ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە

زنجیرەی کتێب (٨١٢)

ماڵپەر: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێشکەشە

* بەو کەسانەی هەنگاوێکیان ناوە، وشەیەکیان نووسیوە، وێنەیەکیان دەرخستووە، دەنگیان هەڵبڕیوە لەپێناو بەرەو پێشبردنی بارودۆخی سیاسی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە هەرێمی کوردستان.

* بەو کەسانەی خەمیان ئاشتی و ئازادی و سەربەخۆیی و دیموکراسییە لە هەرێمی کوردستاندا.

* بەو کەسەی تینوی ڕاستی و زانستن.

# پێرست

# پێشەکی

تەکنەلۆژیای راگەیاندن دەسەڵاتێکی مەزنی بەخشی بە ئامرازەکانی راگەیاندن، ئەویش بریتیە لە دەسەڵاتی بەشداریکردن لە دیاردە سیاسییە جیاجیاکان، لەلایەکیترەوە، بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای راگەیاندنەوە، راگەیاندنکار توانی رۆڵێکی بەرچاو بگێڕی لە چۆنیەتی مامەڵەکردنی هاوڵاتی لەگەڵ پرسە سیاسییەکان و پێوانەکردنی رادەی کارلێککردنی خەڵك لەگەڵ ئەو پرسانە لە رێگەی شرۆڤەکردنی لایەنی جیاجیاکانی پرسە سیاسییەکان و بەستنەوەی دیاردە سیاسییەکان بەیەکەوە بۆ هەڵسەنگاندنی لایەنەکانی سیستەمی سیاسی.

ئەم توێژینەوەیە، کە لە بەشی راگەیاندن/ کۆلێژی ئەدەبیات /زانکۆی سەلاحەدین نووسراوە لەلایەن قوتابی ئەرشەد خەلیل شوانی، هەوڵدانێکە بۆ دۆزینەوەی پەیوەندییەکانی نێوان دیاردەیەکی گرنگی راگەیاندن کە بریتیە لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی راگەیاندن لەلایەن بینەرەوە و دیاردەیەکی سیاسی/ دەروونی، کە بریتییە لە هۆشیاریی سیاسی و پێوانەکردنی رۆڵی راگەیاندن لە هۆشیاریکردنی سیاسی تاکەکان و، بەیەکێك لە هەوڵە زۆر باشەکان لەقەڵەم دەدرێت بۆ تیشك خستنەسەر زانستی راگەیاندنی سیاسی، کە یەکێك لە ئەرکەکانی هۆشیاریی سیاسییە.

کێشەی ئەم توێژینەوەیە کە توێژەر توێژینەوەی لەسەر ئەنجام داوە، کێشەیەکە تا ئێستا مشتومڕی لەبارەوە هەیە، لەبەرئەوەی رۆژانە رۆڵی ئامرازەکانی راگەیاندن لە پرسە سیاسییەکاندا زیاد دەکات، جگە لەوە دوو گۆڕاوی سەربەخۆو بەدواکەوتوو لەخۆدەگرێت، یەکەمیان گوزارشت لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی راگەیاندن دەکات، دووەمیشیان، بریتییە لە رۆڵی ئامرازەکانی راگەیاندن لە گواستنەوەی زانیاری سیاسی و رادەی گرنگییان بۆ جەماوەرو، رۆڵیان لە هۆشیارکردنەوەی جەماوەردا.

ئەم توێژینەوە بەشێوەیەکی گشتی لەسێ بەش پێکدێ:

بەشی یەکەم: وەك دەستپێکی توێژینەوەیەکی زانستی چوارچیوەی توێژینەوەی بۆ توێژینەوەکە دیاری کردووە، کە بریتیە لە دیاریکردنی کێشەی توێژینەوە، پرسیارەکانی توێژینەوە گرنگی توێژینەوە، ئامانجەکانی توێژینەوە، جۆرەکانی توێژینەوە، میتۆدی توێژینەوە کۆمەلگای توێژینەوە، سامپلی توێژینەوە، پلانی توێژینەوە، کەرستەکانی توێژینەوە، ئاستەکانی تۆیژینەوە.

پاشان لەبەشی دووەمی توێژینەوەکە (پاری یەکەم) وەکو بەشی تیۆری بەناونیشانی (راگەیاندن و رۆڵی سیاسیدا) لەچوار باسی سەرەکی پێکدێ، هەوڵمان داوە لە باسی یەکەمدا تیشك بخەینە سەر چەمك و پێناسەی راگەیاندن و، لەباسی دووەمدا باس لە ئامرازو جۆرەکانی راگەیاندن دەکەین، لە باسی سێیەمیشدا سیستەمەکانی راگەیاندن دەخەینەڕوو، لەباسی چوارەمیشدا تیشك دەخەینە سەر ئەرکەکانی راگەیاندن.

پاشان لەبەشی دووەم (پارەی دووەم) وەکو بەشی تیۆری بەناونیشانی (هۆشیاری سیاسی، رۆڵی راگەیاندن لە گەشەکردنیدا) لە حەوت باسی سەرەکی پێکدێ:

لە باسی یەکەمدا چەمکی هۆشیاری سیاسی دەخەینەڕوو، لەباسی دووەمدا پێناسەی هۆشیاری سیاسی دەخەینەروو، لەباسی سێیەمدا گەشەکردنی هۆشیاری سیاسی تیشك دەخەینەسەر، لە باسی چوارەم گرنگی هۆشیاری سیاسی تیشك بخاتەسەر، لە باسی پێنجەم سەرچاوەکانی هۆشیاری سیاسی دەخەینەروو، لەباسی شەشەم یموکراسی و هۆشیاری سیاسی دەخەینەڕوو، لە باسی حەوتەم راگەیاندن و هۆشیاری سیاسی تیشك دەخەینەسەر.

لە بەشی سێیەمی ئەم توێژینەوە لایەنی (مەیدانی توێژینەوەکەیە) وەك کومەلگەی توێژینەوە ماموستایانی کۆلێژی ئەدەبیات وەرگیراوە توێژەر لەرێگەی خشتە راپرسییەکی ئەنجامدا، دوای راپرسی کە چەند دەرئەنجام بۆ توێژینەوەکە ئەدۆزێتەوە، لەکوتایشدا کوتایی بەدەرەنجام و راسپاردەکان کۆتایی بە توێژینەوە هاتووە.

د. حەبیب کەرکوکی

شوبات ٢٠١٤

## کێشە توێژینەوە:

هەموو توێژینەوەیەك كێشەیەك لەخۆدەگرێ، لەم توێژینەوەشدا رۆڵی راگەیاندنەکان بۆ گواستنەوەی زانیاری بۆ مامۆستایانی زانکۆ دەبێت لە هۆشیاری سیاسی، هەروەها جۆری ئەو دەزگا سیاسیانەی بەشێوەیەکی کارا بەشداری ئەو رۆڵە دەکەن.

## پرسیارەکانی توێژینەوە:

- توێژەر لە توێژینەوەکەیدا، کۆمەڵێك پرسیار دەخاتەروو، بۆئەوەی لە چوارچێوەی توێژینەوە ئەکادیمییەکەیدا بەشیوەیەکی زانستیانە وەڵامیان بداتەوە:

- رادەی بایەخدان بە ئامرازەکانی راگەیاندن لەلای مامۆستایانی زانکۆ چەندە؟
- مامۆستایانی زانکۆ زیاتر بایەخ بە چ بابەتێکی سیاسی لە ئامرازەکانی راگەیاندن دەدەن؟
- ئەو ئامرازنە چین مامۆستایانی زانکۆ زیاتر بەکاری دەهێنن؟
- ئایا رەگەز بۆتە گۆڕاوێك کاریگەری هەبێ لەسەر بەدەستهێنانی بابەتی سیاسی؟
- ئایا ئاستی زانستی بۆتە گۆڕاوێك کاریگەری لەسەر بەدەستهێنانی بابەتی سیاسی هەبێ؟

## گرنگی توێژینەوە:

گرنگی ئەم توێژینەوە لە دوو توخمی سەرەکی دەردەکەوێت:

توخمی یەکەم/ گرنگی بگۆری سەربەخۆ کە پێکهاتووە لە ئامرازەکانی راگەیاندن وەك ئامرازێکی کاریگەر لە پرۆسەی سیاسی کە رۆڵێکی لە بەردەوامی سیستەمی سیاسی چالاك دەگێرێت.

توخمی دووەم/ گرنگی دەروازەی هوشیاری سیاسی کە دەگۆنجێت لەگەڵ پێداویستیەکانی سەردەمی هاوچەرخ.

لێرەدا دەتوانین گرنگییەکانی ئەم توێژینەوەیە لەم خاڵانە دیاری بکەین:

ئاستی ئەکادیمی:

سەرەرای چەندین دیراساتی جۆراو جۆر لەسەر راگەیاندن وهوشیاری سیاسی، بەلاّم ئەو توێژینەوانە جەختیان نەکردووە سەر رۆلی راگەیاندن لە پرۆسەی هوشیاری سیاسیوەك چوارچێوەیەکی فیکری بۆ دانانی سنورێکی فیکری تەواو بۆ ئەم بابەتە.

ئاستی پراکتیکی:

گرنکی ئەم توێژینەوە سەرهەلّدەدات لەژێر سایەی ئەو بارودۆخەی کە رووبەرووی جیهان بۆتەوە بەچەندین دیاردەی جۆراوجۆر ناسراوە وەك "سیستەمی جیهانی نویَ" و" جیهانگیری دیاردە سیاسییەکان" و " بلاّبوونەوەی درروشمی دیوکراسی ومافی مرۆڤ" وەك چەند دیاردەیەك کە سیاساتی جیهانی ئیستامان دەجولێنێتەوە.

دتوانین گرنگی لایەنی پراکتیکی لەو چەند خالّە دیاری بکەین:

- چاکردنەوەی ئاستی پرۆسەی پەیوەندی سیاسی کە لایەن ئامرازەکانی راگەیاندن ئەنجام دەدرێت.

- ئاسانکاری بۆ ئامانجی راگەیاندن لە میانی پرۆسەی سیاسی.

- رێنمایی کردنی بەرپرسانی راگەیاندن لە گرنگی پرۆسەی هۆشیاری سیاسی.

- دیراستەتکردنی پراکتیکی بۆ ژینگەی دیراسەتکردن.

هەیە. ئایا تاچەند رۆلّی هەبووە لە هۆشیارکردنەوەی مامۆستایانی زانکۆ تاچەند پشتیان بە ئامرازەکانی راگەیاندن بەست بۆ بەدەستهێنانی زانیاری سیاسی بۆ هۆشیاربوونیان لە سیاسەتدا.

## ئامانجەکانی توێژینەوە:

ئامانجی ئەم توێژینەوە ئەوەیە پێوانەکردنێك زانستی بکریَ رۆلّی راگەیاندن و چۆنیەتی بایەخ و کاریگەری بوونی لەسەر جەماوەر، هەروەها تیشك خستنە سەر رۆلّی راگەیاندن لە کۆمەلّگە بۆ دروستکردن و گەشەکردنی هۆشیاری سیاسی لە تاکەکان

## جۆری توێژینەوە:

ئەم توێژینەوە دەچێتە چوارچێوەی توێژینەوە وەسفییەکان، هەروەك پێناسەی دەکرێت بەوەی کە دەربرینێکە لە پێکهاتەی دیاردەکان، کەگەرەنتی تەواو دەدەن بەماددەی راگەیاندنەکان بۆدەربڕین و روون نکردنەوەیەکی بابەتی پۆخت وئەکادیمی وچەندایەتی.[1]

## میتۆدی توێژینەوە:

بۆ دیارکردنی رۆڵی راگەیاندن لە بەدیهێنانی هۆشیاری سیاسی بە پێویستمان زانی کە بە میتۆدی رووپێوی واتە رووپێوی بۆ ئەم توێژینەوەبەکار بهێنین. کەواتە کۆمەڵگەی توێژینەوە لەم توێژینەوەیەدا هەموو مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەددینە، بە هەموو بەشە زانستییەکانی بەیانیان کراو.

## کۆمەڵگەی توێژینەوەکە:

کۆمەڵگای ئەم توێژینەوە بریتییە لە مامۆستایانی کۆلێژی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەددین کە بریتییە لە (٨٨) مامۆستا لە کۆلیژی ئەدەبیات/ بەیانیان.

## سامپڵی توێژینەوە:

سامپڵی ئەم توێژینەوەیە پێکهاتووە لە (٤٤) سامپڵ مامۆستایانی کولێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددینی وەرگرتووە وەك سامپڵ توێژینەوەکە بەشێوەی هەرەمەکی (رێکخراو) لە کۆمەڵگەی سامپك لێکۆڵینەوەکەمان وەرگرتووە، هەروەك توێژینەوە لە دیاریکردنی سامپڵ توێژینەوەکەی بەنامانجی دەستکەوتنی سامپڵ بەدەست هاتووە، بەرێگایەکی میتۆدی زانستی، رەچاوەی ئەم جۆرە ناساندنەی سامپڵی توێژینەوە کردووە.

---

(١) د.سمير محمد حسين، بحوث الاعلامي،الاسوالمبادی، القاهره ،عالم الكتب،١٩٧٦،ص١٢٣.

## پلانی توێژینەوە:

فۆرمێکی ڕاپرسی بەمەبەستی دابەشکردنی لەسەر دەستنیشانکراوان بۆ بەدەستهێنانی زانیاری سەبارەت بە ڕۆڵی ڕاگەیاندن لە گەشەکردنی هۆشیاری سیاسی، کە ئەم فۆرمە چوار پرسیاری گشتی لەخۆگرتووەو دە پرسیاری تایبەتی بە بابەتی توێژینەوەکە لەخۆدەگرێ.

## کەرەستەی توێژینەوە:

توێژەر لە توێژینەوەکەی کەرستەی فۆرمی ڕاپرسی بەکارهێناوە بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان سەبارەت بە ڕۆڵی ڕاگەیاندن لە گەشەکردنی هۆشیاری سیاسی.

## ئاستەنگەکانی توێژینەوە:

توێژەر ئاستەنگەکانی توێژینەوەکە لەم خاڵانەی خوارەو دەخاتەڕوو:

١. وەك ئاستەنگێکی بەردەوام پەرتوك بە زمانی کوردی لەسەر بابەتەی توێژەر ئاستەنگێکی دیارو هەست پێکراوە لەناو کۆمەڵگەی ئێمە.

٢. کەمیی سەرچاوە لەسەر بابەتی دیارکراوی توێژینەوەکە بەگشتی و هۆشیاری سیاسی بەتایبەتی.

## پاری یەکەم:

## ڕاگەیاندن... چەمك و ئەرکەکانی

### پێناسە و چەمکی ڕاگەیاندن:

وشەی ڕاگەیاندن لەلای کورد لەبەرامبەر (اعلام)ی عەرەبی و (media)ی ئینگلیزی بەکارهاتووە.[2]

لەڕووی زمانەوانییەوە (ڕاگەیاندن) لەزمانی کوردیدا لەبنەڕەتەوە لە دوو پێشگری (ڕا) لەگەڵ چاوگی (گەیاندن) پێکهاتووە، مەبەست پێی (پێڕاگەیاندن)ی بەرامبەر وەرگرە بە بیروڕاو زانیاری و هەواڵێك کە لای وەرگر نامۆیە، بەمەبەستی ئاگادارکردنەوەی وەرگر بەو بیروڕاو زانیاری و هەواڵانەوە، وابەستەکردنی وەرگر بەو دۆخەی کە نێرەر تیایدا دەستەواژەو ڕستەکان دەردەبڕێ.[3]

(کۆمەڵگەی مەشقکردن لەسەر ڕاگەیاندنی ئەمریکی)ش بەم جۆرە پێناسەی ڕاگەیاندن دەکات: (پرۆسەی گۆڕینەوەی بیروباوەڕو زانیارییە لەپێناو دۆزینەوەی لێککەیشتنێکی هاوبەش لەنێوان توخمەکانی مرۆڤایەتیدا).

(دکتۆر ئیبراهیم ئیمام)یش ڕاگەیاندن بەوە پێناسە دەکات کە: (پرۆسەی گواستنەوەی هەست و نەست و بیرو بۆچوون و زانیارییە لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا).

کەچی (عەبدولحافز سەلام) بەمجۆرە پێناسەی ڕاگەیاندن دەکات: (پرۆسەی گواستنەوەی بیرو کارامەیی و ژیرییە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر). ڕاگەیاندن: بریتییە لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕو هەواڵ لەناو خەڵکدا لەڕێگەی چەند کەناڵێکەوە لەپێناو لێحاڵیبوون و قەناعەت پێهێنان و ڕاکێشانی لایەنگری.[4] هەروەها باس لە سیستەمەکان

---

٢ مەجیدساڵح، بنەما تیۆرییەکانی ڕای گشتی و ڕاگەیاندن،سایمانی، چاپخانەی مەکتەبی بیروهۆشیاری، (ی،ن،ك) ٢٠٠٦، ل٨٤.

٣ هەڤاڵ ئەبوبەکر، ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی کوردی، سلێمانی، چاپخانەی ونۆفسێتی تیشك،٢٠٠٢، ل ١٥.

٤ د.عماد محمد حسن الهلالي، التخطيط والتخطيط الاعلامي،بدون مكان طبع، بدون دار نشر، ص ٦٤.

و هەندێ لە ئەرکەکانی ڕاگەیاندن بکەین بە ئامانجی نیشاندانی ڕۆڵ و گرنگی ڕاگەیاندن لە ژیانی مرۆڤدا.

(**مجلة مصورة**): گۆڤارێکە وێنە لەگەڵ نووسینەکانیدا بڵاودەکاتەوە، هەندێ گۆڤار هەیە تەنیا وێنە دەکەن بە بابەتی سەرەکی و بنەڕەتی خۆیان و، لە بڵاوکردنەوەی وێنەی دەگمەن یان وێنەی ڕووداوی گرنگ تایبەتمەندن، بڵاوکردنەوەی ئەم وێنانەش لە شێوەی ڕاپۆرت و لێکۆڵینەوەی وێنەداردا دەبێ واتە (وێنەی بەکامێراگیراو).[5]

نشره أخبار مصوره (بەلاڤۆکی هەواڵی بینراو): کردەوەی بڵاوکردنەوەی ڕاستی و دەنگوباس و بیرو بۆچوون لەناو جەماوەردا بەشێوازی جۆراوجۆری ڕاگەیاندن وەك ڕۆژنامەوانی و ڕادیۆو سینەماو.... هتد، بەئامانجی هۆشیارکردنەوەو بڕواپێهێنان و لایەنگری پەیداکردن.[6]

وسائل اعلام (ئامرازەکانی ڕاگەیاندن): ئەو هۆیانەی زانیاری و ڕاستی بە خەڵك دەگەیەنن، وەك ڕۆژنامەو ڕادیۆو تەلەفزیۆن و سینەماو کتێب، ئەم هۆیانە تەنیا بەوە دەست هەڵناگرن کە ڕاستی و زانیاری پێشکەش بکەن، بگرە ڕۆڵێکی سەرەکیشە بۆ کات.[7]

چەمکی ڕاگەیاندن لەکوردستاندا، هێندەی لەچوارچێوەی دەربڕین و دەرخستنی بیروڕاکاندا ماوەتەوە، ئەوەندە بۆ کایە مەعریفییەکان نەپەڕیوەتەوە، بەهۆی ئەوەی ئایدۆلۆژیای سیاسی بەسەر سیستەمی بەڕێوەبردن و نووسینی پەیامی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن زاڵ بووە.

بەدرێژایی مێژوو، ڕاگەیاندن بەردەوام کاریگەری قووڵ و بایەخێکی زۆر فراوانی لە ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگەکاندا هەبووەو لە سەرەتای پەیدابوونی مرۆڤ تاکو ئێستا، توانیویەتی ببێتە پاڵنەرێکی هەرە گرنگ بۆ بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگەو گوستنەوەی دابونەریتەکان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیتروهۆشیارکردنەوەی تاکەکان لەهەمموو بوارەکانەوە.

کەناڵەکانیش، کەناڵی سنورداری ناوچەیی داخراوبوون، بۆیە کەمتر زانیاری بە وەرگر دراوەو زۆرتر بیروڕای تاکەکەسی یان کاتی، یان گروپێکی خاوەن ئایدییایەکی دیاریکراوی دراوەتێ، بێ ئەوەی گۆڕانە خێراکانی لەناوەڕۆکی پەیامەکاندا ڕوودەدەن

---

٥ بەدران ئەحمەد حبیب فەرهەنگی زاراوەگەلی ڕاگەیاندن، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٥، ل٨٨-٨٩.

٦ بەدران ئەحمەد حەبیب، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٨ -٨٩.

٧ هەڤاڵ ئەبوبەکر، چەند هەنگاوێك بەرەو ڕاگەیاندن، ڕۆژنامەنووسی، پڕوپاگەندەو ڕای گشتی، سلێمانی، چاپخانەی هەواڵ، چ دووەم، ١٩٩٧، ل٥.

هیچ پلانێکی ستراتیژی درێژخایەنیان بۆ دانرابێت، بۆیە کاریگەرییەکی کەڵەکەبووانە لەنێو کایەکانی راگەیاندنی کوردیدا، وەك ئەوەی دەبێ ببێ، بەدی ناکرێ.[8]

(چارلز مۆریس) بەم جۆرە پێناسەی راگەیاندن دەکات: (زاراوەی راگەیاندن کاتێك بەشێوەیەکی فراوان و بەربڵاو بەکاردەهێنین، ئەو کاتەیە کە بەشداریکردنی ژمارەیەك کەس لە کارێکی دیاریکراودا لەخۆ دەگرێت). بەڵام (جۆرج لندبرج) راگەیاندن بەوە پێناسە دەکات دەڵێت: (کارلێکە بەهۆی هێماوە).

(ویلبر شرام)یش دەڵێت (راگەیاندن ئەو ئامرازەیە کە لێکگەیشتن لەنێوان کۆمەڵگەکاندا مسۆگەر دەکات، ئەمەش بەسروشتی خۆی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەکۆمەڵگەکانیتر جیا دەکاتەوە)[9]

راگەیاندن وادەناسرێ کە پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری و دووبارە رەوانەکردنیەتی بۆ جەماوەر.[10]

راغب دەڵێت: (راگەیاندن، الاعلام) تایبەتە بەهەواڵی نوێ و خێرا، هەرچی فێربوونە (التعلیم) تایبەتە بەو زانیارییانەی دووبارە دەکرێنەوە تا کاریگەری لەسەر فێرخواز بەجێ دێڵن.)[11]

یەعقوبییش لەوبارەیەوە دەڵێ (گەر پێت بگوترێ: بزانە (اعلم). دەڵێی: زانیم، بەڵام ئەگەر پێت وترا، فێربە (تعلم) ناڵێ: فێربووم).[12]

(ئیبراهیم ئیمام) بەم شێوەیە راگەیاندن دەناسێنێ: (بریتییە لە بڵاوکردنەوەی هەواڵ، بیروڕا، بابەتی راست.... لەرێگای کەناڵە جیاجیاکانی راگەیاندنەوە).[13]

---

٨ هەمان سەرچاوە، ل ٢٨.

**٩ د.عماد محمد حسن الهلالی، مصدر سابق، ل٦٤.**

١٠ د.حەبیب کەرکوکی، راگەیاندن و سیاسەت، وانەی قۆناغی چوارەم کۆلێژی ئەدەبیات / بەشی راگەیاندن، بۆ ساڵی خوێندنی، ٢٠١٠-٢٠١١، ل١١.

١١ **محمد مرتضی**الزبیدی، تاج العروس فی جواهر القاموس،بدون دار نشر، ج (٨)، ص ٢١٣.

**١٢ شاکر ابراهیم، الاعلام و وسائلة ودورة فی التنمیة الاقتصادیة، بدون دار نشر، ٢٠٠٣، ص ٣٢.**

١٣ عمارە جیب، الاعلام فی ضوءالاسلام، بدون دار نشر، ٢٠٠٠، ص١٦.

راگەیاندن بەئاسوودەییەکی دەروونی کۆمەڵایەتی بەختەوەر دەکات، ئەم تاکە بەگیانێکی یارمەتیانەی ئەوتۆ جیادەکرێتەوە کە سیمای دڵاوایی و دروستکراوەیی و سۆزو خۆشەویستی و خزمەتی خەڵکی پێوەیە.[١٤]

راگەیاندن چەمکێکی ئاڵۆزە بۆیە تائێستاش واتایەکی وردو دیاریکراوی بۆدانەنراوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵدەدەین واتا زاراوەیی و زمانەوانییەکەی راگەیاندن پیشان بدەین.[١٥]

راگەیاندن وەك هەر چەمکێکی تری نێو دونیای زانست و مەعریفە و رۆشنبیری، لەسەر هەردوو ئاستی زمانەوانی و زاراوەییدا دەکرێ بناسێنرێ، بەتایبەتی کاتێ ئەو راستییە بزانین لەخاڵێکدا کە دەست گەیشتنە بەزانیاری، پەیوەندییەکی ئۆرگانی لەگەڵ فێربوون هەیە.

لەلایەنی زاراوەییشەوە: راگەیاندن واتە بڵاوکردنەوەو پەخشکردنی زانیاری دەربارەی رووداوو بابەتێك، بەشێوەیەکی راست و دروست و ورد بەمەبەستی رازیکردنی وەرگرو سەرنج راکێشانی، دەبێ ئەو راستییەش بزانین کە مەرجیش نییە پرسی راستی و دروستی سەد لە سەد بێت لەکاری راگەیاندندا، چونکە کۆمەڵێك پێشمەرج و زەمینە هەن کەرێژەی زیاتری راستی لە و پرۆسەیەدا مسۆگەر دەکەن.[١٦] پسپۆرانی بواری راگەیاندن دەڵێن: راگەیاندن بریتییە لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕو هەواڵ لەناوخەڵکدا لەرێگەی چەند کەناڵێکەوە لەپێناوی لێحاڵیبوون و قەناعەت پێهێنان و راکێشانی لایەنگری، ئەم پێناسەیە جەخت لەسەر ئەم خاڵانە دەکاتەوە:[١٧]

١- بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ و هەواڵ (پەیام)

٢- ئەو هەواڵ و باوەرانە بۆکۆمەڵی خەڵکە واتە (پەیام وەرگر)

٣- لەرێگەی چەند کەناڵێکەوە (بینراو، بیستراو، نوسراو)

٤- بۆ لێکحاڵیبوون و قەناعەت پێهێنان (کاریگەری بەجێهێشتن)

راگەیاندن بریتییە: لەو چالاکی و پەیوەندیکردنەی دەبێتە هۆی گەیاندنی هەواڵ و زانیاری دروست لەبارەی بابەت و کێشەکان بەجەماوەر، ئەوەش دەبێتە هۆی دروستکردنی شارەزایی و هۆشیاری پەیام وەرگرەکان، بەمەش رای گشتی پەیام وەرگرەکان سەبارەت بەو

---

١٤ نادیە عومەر کاکەسور، رۆڵی ئافرەتی کورد لەراگەیاندنی کوردی، لێکۆڵینەوەی مەیدانی، ٢٠٠٤، ل ٢٢.

١٥ احسان محمد الحسن، المدخل الى علم الاجتماع الحديث، بغداد، مطبعة الجامعات، ١٩٧٦، ص٢٠.

١٦ نوری بێخاڵی، راگەیاندن و کاری رۆژنامەگەری، هەولێر، بەرێوەبەرایەتی چاپخانەی رۆشنبیری، ٢٠٠٦، ل٢٤.

١٧ د.محمد منير حجاب، المعجم الاعلامي، القاهرة، دار الفجر للنشر والتوزيع، ٢٠٠٤، ص٦١.

کیشه و بابەتانه دروست دەبێت. ڕاگەیاندن یەکێك لەم چەمکانەیە لەگەڵ بوونی مرۆڤەوە هەیە، ناکرێ ببەسترێتەوە بەشارستانیەتێك یان قۆناغێکی مێژوویی لەبەرئەوەی مرۆڤ ناتوانێ بەتەنیا بێت و پراکتیکی ئەم کارە نەکات و پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەرەکەی نەبێ، ئەمرۆ لەدونیای مۆدێرن و جیهانگیریدا گرنگی و تایبەتی خۆی هەیە، لەبەرئەمە ڕاگەیاندن وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و پێویستییەکی مرۆیی، بەدرێژایی مێژوو لەهەر کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو و دواکەوتوو گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەبووە، لەبەرئەوەی تاکەکان لەنێوان خۆیان بەپێی ئەو سەردەمەی کە مرۆڤایەتی پێیدا تێپەڕیوە بە سروشتی خۆیان پراکتیزەی کاری ڕاگەیاندنیان کردووە.[18]

ڕاگەیاندن وەك چەمکێکی پەیوەندار بەپێکگەیشتن، بەو واتایە هاتووە کە خەڵکی لەهەواڵ و بیروڕاو ڕاستیەکان ئاگادار دەکاتەوە، توانای ئەوەیان پێ دەبەخشێ ڕایەکی ڕاست و دروست لەبەرامبەر کێشەیەکی دیاریکراودا دروست دەبێ، زانای ئەڵمانی (ئاتوگرێت) پێیوایە ڕاگەیاندن دەربڕینێکی بابەتییانەی ڕۆح و عەقڵیەتی جەماوەرە.[19]

ڕاگەیاندن ئەمرۆ بووە بەدیاردەیەك بەتوانستێکی مانەوەی تەکنیکی زۆرەوە تێکەڵ بە شارستانیەتی سەدەیەك بووە کە هیچ میللەتێك و دەوڵەتێك نەیانتوانیوە دەستبەرداری بن، بەم پێیەش بێ ڕاگەیاندن بووە بە هونەری پەیوەندیکردن بەچین و توێژەکانی نێو کۆمەڵ و کارلێککردنیان بەهەردوو دیووی بەئامانجی نیشاندانی ڕاستییەکان و ئاگادارکردنەوە لەڕووداوو پێشهاتەکان، دیوەکەی تریش، چەواشەکردن بۆ مەبەستێکی تایبەتی و سنووردار.[20]

فەرنا ندترۆ لەکتێبێکیدا بەناوی (ڕاگەیاندن) دەڵێ: ڕاگەیاندن بریتییە لەبڵاوکردنەوەی ڕەگەزەکانی مەعریفە (ڕووداو) یان بڕیاردان (لێدون و بیروڕا لەدارشتنێکی گونجاودا بەهۆی وشە یان دەنگ یان وێنەوە) بەشێوەیەکی گشتی لەڕێگەی کەناڵەکانی پێگەیاندنی جەماوەرەوە.

---

١٨ المصدر نفسه، ص٦١.

١٩ نەجات ڕوستی، میدیای هەواڵ و ڕای گشتی سلێمانی، چاپخانەی بینایی، ٢٠٠٩، ل ١٦-١٩.

٢٠ نەژاد عزیز سورمێ، ئاژانسی دەنگوباسی کوردستان، هەولێر، پرۆژەی دامەزراندن و بەڕێوەبردن، بێ ساڵی دەرچوون، ل ٢٠١.

## ئامرازەكانی راگەیاندن:

ئەو كارانەی راگەیاندن كاری لەسەر دەكات لە هەواڵ و پەیامی جۆراوجۆر و پرۆگرام و بەرنامەی جیاوازو فیلم و پروپاگەندەی جیاواز، بۆ مەبەستی دیاریكراو ئامادە دەكرێن و پێشكەش دەكرێن، بەمەبەستی هێنانەدی ئامانجی دیاریكراو، ئەویش لەرێگەی ئامرازە جیاوازەكانیەوە پەخش دەكرێن و دەگەیەنرێنە خەڵك، كە ئامرازەكانی بریتین لەرۆژنامەو گۆڤارو رادیۆ و تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت، هەریەكەیان بەشێوەیەك كار دەكات:

### ١- رۆژنامە و گۆڤار:

ئامرازێكی راگەیاندنە، كۆنترە لەهەریەك لەرادیۆ و تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت، داهێنانی چاپ و چاپەمەنی گرنگییەكی گەورەی هەبوو لەدەركەوتنی رۆژنامەو گۆڤار، كە رۆڵێكی گرنگی هەبوو لە پێشكەوتنی بوارە جیاوازەكانی كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری لەگەڵ پێشكەوتنی تەكنەلۆژیا ئەویش پێشكەوتووە، بەئامرازێكی گرنگ دادەنرێ لەباوەرپێهێنان و دروستكردنی كاریگەری لەسەر رای گشتی و ئاراستەكردنی.[21]

لەرێگەی پێشكەشكردنی زانیاری و هەواڵی جۆراوجۆر لەبواری كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و كلتووری و ژینگەیی، كە یارمەتیدەرە بۆ خەڵك لە دروستكردنی رایەكی دروست لەسەر بابەتە جیاوازەكان و گواستنەوەی كلتوورو زانیارییەكانی كۆمەڵگە لەنەوەیەكەوە بۆ نەوەیەكیترو چاودێری بەسەركار و ئەركی دامودەزگاكانی حكومەت و هوشیاركردنەوەی خەڵك لەسەر بابەتە جیاوازەكان بەتایبەت خەڵكانی خوێندەوار، یارمەتیدەریشە بۆ بەرزكردنەوەی ئاستی هزری و رۆشنبیری، یەكێك لە سیفەتەكانی رۆژنامەو گۆڤار ئەوەیە، كە خوێندەواران زیاتر سوود لەم ئامرازە وەردەگرن لەنەخوێندەواران، بۆیە لەشاردا زیاتر بەرچاوە رێژەی خوێندەواران كاریگەری هەیە لەسەر تیراژی، لەهەمان كاتدا سروشتی كۆمەڵگەش رۆڵی هەیە تیایدا، لەبەر گرنگی رۆژنامەو گۆڤار (هیگڵ ١٧٧٠-١٨٣١) دەڵێ: (خوێندنەوەی رۆژانەی رۆژنامە لای پیاو، وەكو نوێژی بەیانی وایە).[22]

---

٢١ سهير جاد، وسائل الاعلام والاتصال الاقناعي، بدون مكان نشر، الهيئة المصرية للكتاب، ٢٠٠٣، ص١٣٢.

٢٢ د.محمد عبدالقادر حاتم، مصدر سابق، ص ٧٠٥.

### ٢-ڕادیۆ:

لەدوای ڕۆژنامە و گۆڤار، ڕادیۆ بە دووەم ئامرازی ڕاگەیاندن دادەنرێ، کە لە توانایدایە بگاتە هەموو شوێنێك.[٢٣] هەموو تاکێکی خوێندەوارو نەخوێندەوار سوودی لێ وەردەگرن. لەدوای پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا، تواناکانی ئەم ئامرازە لە پەخش و گەیاندن و بچوکبوونەوەی قەبارەیدا پێش کەوت، کە هەموو تاکێك بتوانێ بەکاری بێنێ بە ئاسانی لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرێ، هەر ئەم پێشکەوتنەش بووە هۆی ئەوەی ڕادیۆ لە توانایدا بێت ئاخاوتن لەگەڵ هەموو تاکەکان بکات لە هەر ئاستێکی ڕۆشنبیریدابن و لە کاریدا خێراتر بێت لە ڕۆژنامە و گۆڤار.[٢٤]

گرنگی هەبێ لە ڕیکلام و ئاگاداری و دروستکردنی ڕای گشتی و ئامرازێکی ڕۆشنبیرکردن و گەیاندنە لەنێوان حکومەت و هاوڵاتیان، لەنێوان پارتە سیاسیەکان و کۆمەڵە جیاوازەکان و ڕووناکبیران. هەروەها لە کاتی دروستبوونی ململانێ و قەیران و جەنگدا گرنگی تایبەتی هەیە لە کۆکردنەوەی خەڵك بەرەو ئاراستەیەکی دیاری کراو.

لێرەدا هێزی باوەر پێهێنانی ئەم ئامرازە دەردەکەوێ، کە لەتوانایدایە کاریگەری دروست بکات لەسەر هزرو ئاراستە و ڕەفتاری بەکاربەرانی، ئەمەش دەوەستێتە سەر شێوازی ناوەرۆکی بابەتەکان و ئامادەو پێشکەشکردنیان، هەروەها بە چەند زمانێکی جیاوازیش پەیامەکانی بگەیەنێ.

چەند ئەرکێکی گرنگیشی هەیە لەوانە گەیاندنی هەواڵ و ڕێنوێنیکردن و ڕۆشنبیرکردن و فێرکردن و پێگەیاندن و ئاراستەکردن و بەهێزکردنی هەستی نیشتمانی و دروستکردنی ڕای گشتی، پاراستنی بەرژەوەندی گشتی، گەشەپێدان، ڕێنماییکردن و پالپشتی لە بەها نوێیەکان، کە لەگەڵ ژیانی سەردەم دەگونجێن و بلاوکردنەوەی هۆشیاری جۆراوجۆرو ئاگادارکردنەوە پێویستەکان و بلاوکردنەوەی بیری سەردەمیانە و دروستکردنی گۆرانکاری لەناو کۆمەڵگەدا.[٢٥]

### ٣- تەلەفزیۆن:

---

٢٣ ملفين ل ديفلر و ساندرا روكيتش،بدون مكان ، بدون دار نشر، ل١٣٦.

٢٤ د.محمد علی البدوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٧-٨.

٢٥ د.محمود یوسف، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠١.

که له نیوەی یەکەمی سەدەی بیست داهێنرا، بەتواناترین ئامرازی راگەیاندنە، که مرۆڤایەتی ناسیویەتی، وێنەو دەنگ بەیەکەوە پەخش دەکات واتە هەستی بینین و بیستن، دوو هەستەوەری گرنگن له خودی مرۆڤ. بەتایبەتی چاو که وێنەکان له رێگەیەوە وەردەگیرێن و له مێشکی مرۆڤ پەسەندە دەکات، بۆیە باوەڕی زیاتر لای تاك دروست دەکات و بەهێزە له راکێشانی سەرنجی خەڵك.[26]

تەلەفزیۆن زانیاری جۆراوجۆر به دەنگ و وێنەوە دەگەیەنێتە هەموو تاکەکان خوێندەوارو نەخوێندەوار له هەر ئاستێك و تەمەنێکدا بێت. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی له پێشەوەی ئامرازەکانی تردا بێت و کاتێك بابەتێك پێشکەش دەکرێ بەشێوەی خوێندنەوە کاریگەرییەکەی جیاوازە لەگەڵ ئەوەی ئەم بابەتە وێنەشی لەگەڵدا بێت، هەروەها له گواستنەوەی هەواڵ و رووداوە جیاوازەکان له هەر کوێیەك بێت بەخێرایی دەیانگوازێتەوە یان بەشێوەی گواستنەوەی راستەوخۆ.[27]

هەندێ وای دەبینن تەلەفزیۆن ئامرازێکی خۆشگوزەرانییە هەندێکیتر وایدەبینن توانایەکی بەهێزی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری و فێرکاری فراوانی هەیە و، بیروڕای جیاوازی سیاسی و روماڵکردنی هەڵبژاردنەکان، کات بەسەربردن.[28] تەنانەت کاریگەری تەلەفزیۆن رۆچووە له بوارە جیاوازەکانی کۆمەڵگە، مرۆڤ له سەردەمی ئەمڕۆدا بۆتە بەرهەمی کاریگەری تەلەفزیۆن لەبەر ئەم رۆڵەی تەلەفزیۆن. هەروەکو (رام و جروس و دوب) ئاماژە بەوە دەکەن که تەلەفزیۆن هاوکارە له جوڵەی کۆمەڵایەتی و روانین و شارستانیەتی.[29] هەروەها رۆڵی له دیاریکردنی ناسنامەی نەتەوەیی لای تاکەکانی کۆمەڵگە و خۆشەویستکردنی.[30]

---

٢٦ محمد علی القوزي، نشاة وسائل الاتصال و تطورها، بيروت، دارالنهضة العربية، ٢٠٠٧، ص١٨٥. وانظر: ملفين ل ديفلر و ساندرا بول روكيتش، مصدر سابق، ص ١٦٨-٧٧.

٢٧ د.احسان محمد الحسن، علم الاجتماع التربوي، عمان، دار وائل للنشروالتوزيع،٢٠٠٥،ص٢٨١.

٢٨ جون كورنر، التلفزيون و المجتمع، ت: د.اديب خضور،دمشق، المكتبة الاعلامية، ١٩٩٩، ص١٢-١٣. وانظر: د.نسمة احمد بطريق، مصدر سابق، ص٤٥.

٢٩ د.عبدالرزاق محمد الدليمي، عولمة التلفزيون، عمان، دار للنشر و التوزيع، ٢٠٠٥، ص١٧.

٣٠ كريس باكر، التلفزيون و العولمة و الهويات الثقافية، ت: علا احمد اصلاح، القاهرة، مجموعة نيل العربية، ٢٠٠٦، ص ١٨.

٤- ئینتەرنێت:

چەمکی ئینتەرنێت لە international net work وەرگیراوە واتە تۆڕی جیهانی، تۆڕێکی گەیاندنی نێودەوڵەتییە بەکاردێ بۆ گواستنەوەی زانیاری و پەیوەندیکردن لەرێگای تۆڕێکی کۆمپیوتەر کە پێکەوە بەستراون، هەروەها بە تۆڕی جاڵجاڵۆکەش ناودەبرێ.[31]

ئینتەرنێت لەنوێترین داهێنانی تەکنەلۆجیایە لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، کە کاریگەریەکی بەهێزی لەسەر مرۆڤایەتی هەبووەو بەشێوەیەکی زیندوو دەتوانێ کاری خۆی بکات، بۆتە ناوەندێك لەنێوان مرۆڤ و ئەو جیهانەی تیایدا دەژی، پەنجەرەیەك کەلەرێگەیەوە دەبیینێ و چاودێری هەموو چالاکیەکانی تاك و کۆمەڵ و دامودەزگاکانە، هەواڵ و رووداوە جیهانییەکان، وەرگرتنی زانیاری هەمەجۆر لەهەر شوێنێك بیەوێ پێی دەگات، هەروەها ئاشنابوون بە کلتورە جیاوازەکان و دروستکردنی هاورێیەتی و بەهێزکردن و دەوڵەمەندکردنی هزری مرۆڤ بەبەردەوامی.[32]

٥- سینەما:

هەر یەکێك لەم هۆیانەش شێوەی بەکارهێنانێکی تایبەتی خۆی هەیە، هەریەکەشیان خەسڵەتی تایبەت بەخۆیان هەیەو ئەو هۆکارەش لەیەکتریان جیا دەکاتەوە، هۆیەکی تری جیاواز لەرووی پەیوەندیانەوەوە بەجەماوەر و وەرگرەوە لەجۆری ئەو پەیامەش کە هەڵیدەگرن، یان لەرووی ئەو کاریگەرییەی لەسەر وەرگر دروستی دەکەن، لێرەدا پرسیار دروست دەبێ کە ئایا مەبەست لێی راگەیاندنە یان رۆشنبیری یان کات بەسەربردنە.[33]

---

٣١ د.حميد جاعد محسن الدليمي، مصدر سابق، ل٩٨.

٣٢ محي الدين خيرالله العوير، اثر الاعلام المعاصر، دمشق، دار النهضة، ٢٠٠٧، ص ٨٠.

٣٣ نەجات روستی، سەرچاوەی پیشوو، ل٢٤.

**ناوەرۆكی ئامرازەكانی راگەیاندنی جەماوەری:**

• ناوەرۆكی لاواز: مەبەست لەو ناوەرۆكەیە كە ژمارەیەكی زۆری جەماوەری وەرگر وەریدەگرن و بەردەوام مایەی رق و كینی پسپۆرانی راگەیاندنە، لەوانەش: فیلمی توندوتیژی و شەڕانگێزانە كە لەتەلەفزیۆندا نمایش دەكرێ و هانی توندوتیژی دەدات، هەروەها فیلمی سێكسی ئابڕووبەرو ئەو فیلمە كارتۆنیانەی كە تاوانكاری پیشان دەدەن، لەو ناوەڕۆكانەن كە دەبنە هۆی دابەزاندنی چێژی گشتی.

• ناوەڕۆكێك مشتومڕ نەورووژێنێ: مەبەست لەو ناوەڕۆكەی ئامرازەكانی راگەیاندنی جەماوەرییە كە بەشێوەیەكی فراوان بڵاو دەكرێنەوەو جەماوەرێكی زۆری وەرگر وەریان دەگرن، بەدەگمەنیش نەبێ شارەزایانی راگەیاندن قسەی لەسەر ناكەن، چونكە بابەتگەلێكیان تێدا نییە بۆ گفتوگۆو مشتومڕ وەكو راپۆرتی كەشناسی.

• ناوەڕۆكی بەبڕشت (ئاستبەرز): ئەم ناوەڕۆكە كەمتر بڵاو دەكرێتەوە، شارەزایانی راگەیاندن وا هەست دەكەن باشترین ناوەرۆكە، چونكە بەشداری لە بەرزكردنەوەی ئاستی چێژوەرگرتنی گشتی جەماوەری وەرگر دەكات و، دەبێتە هۆی بەرزكردنەوەی ئاستی رەوشتی و رۆشنبیرییان، لەو جۆرە ناوەڕۆكانەش: مۆسیقای رەسەن و گۆڤاری تایبەتمەندی راستگۆو بەرنامەی رامیاری و كۆمەڵایەتی و رۆشنبیری ئامانجدارو وتاری زانستیانە.[٣٤]

**سیستەمەكانی راگەیاندن:**

سیستەمەكانی راگەیاندن بەشێوەیەكی گشتی دابەش دەبێ بۆ دوو دەستە:[٣٥]

ا- **سیستەمی پێشگیرانە:** پێش بڵاوكردنەوەی هەواڵ رێگەیان لێدەگرێ. لەپاش ئەو دابەشكردنە، دەكرێ بۆ دەستەی تر پۆلێن بكەین: سیستەمی ئامرانە، سیستەمی كۆمۆنیستی، سیستەمی پەرەپێدان.

---

٣٤ د. حەبیب كەركووكی، پێشەكییەك بۆ زانستی راگەیاندن، دهۆك، چاپخانەی خانی، ٢٠٠٨، ل ٤٣.

٣٥ مەجید سالح، بنەما تیۆرییەكانی رای گشتی و راگەیاندن،سلێمانی ،چاپخانەی مەكتەبی بیرو هۆشیاری، (ی،ن،ك) ٢٠٠٦، ل ٩٢-٩٤.

ب- **سیستەمی بەدواداچوون:** پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵ بەدوایدا دەچێ.

### یەکەم/ سیستەمی ئامرانە:

لەم سیستەمەدا پێش بڵاوبوونەوە (هەواڵ) دەبێ بە چەندین کەناڵدا تێپەڕ ببێت و پاش وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەنجا پەخش بکرێ، خاوەندارێتی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەتەواوی لەژێر کۆنترۆڵی حکومەتدایەو تاك بڕیاری ئەوەڵ و ئاخری لەدەستدایە، لەم سیستەمەدا سانسۆر زۆر بەخەستی بەکاردێ، ڕاگەیاندنەکان ئەگەر هەنگاوێکی دژ بە سیاسەتی ڕەسمی حکومەت هەڵنێن، ئەوا داخستن و زیندانی.. چاوەڕێی سەرپێچیکەران دەکات، لەم سیستەمەدا دەسەڵاتداران هیچ مافێك بە میدیاکان نادەن بۆ ڕەخنەگرتن و لەپێش چاپکردن، یان پەخشکردن هەموو بابەتەکان دەبێ زۆر بەوردی چاویان پێدا بخشێنرێ.

### دووەم: سیستەمی کۆمۆنیستی:

لەم سیستەمەدا لە جێگەی تاك، حزب بڕیار دەداو هەر حزبیش هێڵە سەرەکییەکانی کاری میدیاکان دەستنیشان دەکات، هیچ ڕاگەیاندنێکی حزبەکانیتر نابێ لە هێڵی ئایدۆلۆژی کۆمۆنیزم لابدەن، لەسیستەمی کۆمۆنیستیدا سێ ئەرکی سەرەکی بۆ میدیاکان دەستنیشان کراوە: پڕوپاگەندە، سازکردنی هەڵچوون و ئاراستەکردن. لە ڕژێمە کۆمۆنیستەکاندا میدیاکان کەرەستەن بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی حزب کاری بۆ دەکات، بنەماو تایبەتمەندییەکانی پیشەی ڕۆژنامەوانی لە سیستەمی سۆسیالیستیدا جیاوازە لە سیستەمەکانیتر، هەواڵەکان لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدایە، (کوباو کۆریای باکوور) دوو نموونەی ئەم سیستەمەن.

### سێیەم: سیستەمی پەرەپێدان:

بریتییە لە سیستەمی پەرەپێدان، پەرەپێدانی ئابووری و کارکردن بۆ نەهێشتنی هەژاری و نەخوێندەواری و هۆشیارکردنەوەی خەڵك لەڕووی سیاسی و تەندروستی و کۆمەڵایەتی و کلتوورییەوە، لایەنگرانی ئەم سیستەمە پێیانوایە تا ئەو کاتەی ماوەی

نێوان وڵاتانی هەژارو دەوڵەمەند هەیە، ناکرێ میدیاکان لەدژی بەرژەوەندییە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەکاندا بوەستن، جیاوازی لەنێوان ئەم سیستەمە و ئەوانیتر لەوەدایە، لێرە فکرو ئایدۆلۆژیا باڵادەستە، خاوەندارێتی کەناڵەکان دەکرێ بەدەست کەرتی تایبەت بێت، بەڵام ئەگەر لەرێگەی پەرەپێدانی ئابووری بەرژەوەندی نەتەوەیی لایاندا، ئەوکات حکومەتەکان دەتوانن چالاکییەکانیان راگرن، (مالیزیاو کۆریای باشوور) دوو نموونەی ئەم سیستەمەن:

**سیستەمی بەدواداچوون:**

ئەم سیستەمەش دەکرێ بەدوو بەشەوە:

## ١- سیستەمی ئازاد:

لێرەدا مرۆڤ ئازادە لە وەرگرتنی زانیاری و هەڵبژاردن، ئەم سیستەمە هەڵقوڵاوی ئەندێشەکانی (جۆن لوك، ژان ژاك رۆسۆ، ژن ئیستورد و ژان میلتۆن)ە، کاری دەوڵەت لەم سیستەمەدا فەراهەمکردنی خواستەکانی تاکە، حکومەتەکان پولورالیزم و کارئاسانی بۆ خەڵك دەکەن، تاکو دەستیان بگات بەو سەرچاوانەی کە کار لەئایندەیان دەکەن.

ئەرکەکانی میدیاکان لەم سیستەمەدا چاودێریکردنی باری کۆمەڵایەتی و سیاسی و وڵات و رەخساندنی هەلی بەشداریکردنی خەڵك لە کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییە، رادیۆو تەلەفزیۆن و رۆژنامە و ئینتەرنێت لەم سیستەمەدا سەربەخۆو ئازادن و، دەتوانن رەخنە لەهەموو شتێك بگرن کە دژ بە بەرژەوەندی جەماوەرە.

## ٢- سیستەمی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی:

سەرهەڵدانی هەندێ رەخنەو گلەیی لە سیستەمی ئازادو بەکارهێنانی ئازادی بەشێوەیەکی هەڵە، کارێکی وایانکرد جارێکیتر بەو سیستەمەدا بچنەوە خاڵە لاوازەکانی دەستنیشان بکەن.[٣٦]

---

٣٦ مەجیدسالح، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٤-٩٦.

## سیستەمی راگەیاندن پێنج پێکهاتە لەخۆدەگرێ:

١. فەلسەفەی راگەیاندن: ئەو بنەمایانەیەکە بریتین لەچوارچێوەی راگەیاندن لە وڵاتێك.

٢. سیاسەتی راگەیاندن: کۆمەڵێك بنەمایەکە دەزگای راگەیاندن پابەند دەبێ پێی.

٣. یاسای راگەیاندن: کۆمەڵێك یاسایە کە کارکردنی رۆژنامەگەری رێك دەخات.

٤. تەکنەلۆجیای راگەیاندن: جۆری ئەو ئامێرانەیە کە بەکاردەهێنرێ لە دەزگاکانی راگەیاندن.

٥. کارکردنی راگەیاندن: بریتییە لەرەفتاری ئەو دەستەیەی لەدەزگاکانی راگەیاندن ئیش دەکەن.[37]

فەلسەفەی راگەیاندن تەعبیر لە کلتوری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری دەکات، چونکە ناکرێ کاریگەری هەر سیستەمێ لەسەر ئەوانیتر جیا بکرێتەوە، تەنانەت ئەگەر هەوڵبدرێ لەرێگەی توێژینەوەی زانستی تایبەتمەندییەکانی دیاری بکرێ، بۆیە کۆمەڵێك راستی هەن دەبێ دانیان پێ بنرێ، لەوانە:

١- هیچ کەسێ ناتوانێ لەدەزگاکانی راگەیاندن دابڕێ.

٢- ئەم دەزگایانە کۆمەڵێك ئەرك جێبەجێ دەکەن، وەکو: ئەرکی هەواڵی و ئەرکی سیاسی، هەروەها ئەرکی کات بەسەربردن، ئەرکی رۆشنبیرکردن و ئەرکی فێرکردن.

٣- خۆگونجاندن لەنێوان سیستەمی راگەیاندن، سیفەتێکە هەموو دەزگاکان هەوڵدەدەن بەدەستی بێنن.

## ئەرکەکانی راگەیاندن:

کاری راگەیاندن کارێکی جەماوەری و تاکەکەسیشە، واتە بەشداریکردن لەپرۆسەی راگەیاندندا بێ سنوور و چوارچێوەیە، تەوژمی شۆڕشی زانیارییەکانیش رۆژ لەدوای رۆژ ژمارەی بەشداریکەران بەرفراوانتر دەکات، ئەرکەکانیش زیاتر دەکات، لێرەدا بەپێویستی دەزانین ئەرکە سەرەکییەکانی کاری راگەیاندنی هاوچەرخ لە چەند خاڵێکدا

---

٣٧ د.حەبیب کەرکوکی، سیستەمی راگەیاندن، هەولێر، گۆڤاری رۆژنامەنوس، ژمارە ١٧، هاوینی، ٢٠٠٩، ل١٣٣.

دەستنیشان بکەین. ڕاگەیاندن بەوەی چالاکییەکی تاکەکەسی و بەکۆمەڵ و جەماوەریشە و، بەشداریکردن لەبیرو بۆچوون و خستنەڕووی ڕاستییەکان و ڕاگەیاندراوەکان دەگرێتەوە، بۆیە کۆمەڵێك ئەرکی جۆراوجۆر دەگەیەنێ، کە دەتوانین ئەرکە سەرەکییەکانی ڕاگەیاندن بەم جۆرە بخەینەڕوو:

١- کۆکردنەوەو پاشکەوتکردن و چارەسەرو بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاری و ڕاگەیاندراوەکان و وێنەو بیروڕاکان لەپێناوی تێگەیشتنی ژینگەی دەوروبەرو هەڵسوکەوت و مامەڵەکردن تیایدا بەشێوەیەکی زانستی و کارامەیی و لێهاتوویییەوە.[٣٨]

٢- هەواڵ و پەیام و بیروڕاو لێدوانە فەرمی و نافەرمییەکان بە وەرگر (جەماوەر)، بۆئەوەی بەشارەزاییەوە هەڵوێست و بڕیار لەسەر ڕووداوو کارەساتە ژینگەیی و نەتەوەیی و نێودەوڵەتییەکان بدات، پێویستی بەوە هەیە لەماوەیەکی کەمدا ئاگای لەهەموو هەواڵە ناوخۆیی و جیهانییەکان هەبێ.

٣- دیالۆگ و وتووێژکردن: ئەم سەردەمە زیاتر پێویستی بەوە هەیە دیالۆگی بەرهەم لەگەڵ دەوروبەریدا ساز بکات و ڕاستییەکان و بیروڕا جیاوازەکان ئاڵوگۆڕ بکات، سادەترین خێراترین و ئاسانترین ڕێگەش کەناڵەکانی ڕاگەیاندنە.[٣٩]

٤- ڕاهێنانی هاووڵاتیان کە چۆن بتوانن بڕیاری سیاسی بدەن.[٤٠]

٥- یارمەتیدانی تاکەکانی کۆمەڵگە لەپێکهێنانی ڕایەکی گشتی دروست لەسەر ڕووداوەکان.[٤١]

٦- پەیداکردنی زانیاری نوێی ئەوتۆ کە یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ بڕیاروەرگرتن و هەڵسوکەوت نواندن بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە پەسەند بێت.[٤٢]

٧- گەشەکردنی کۆمەڵایەتی: خۆی لەدابینکردنی گەنجینەیەکی هاوبەشی زانست و زانیاری دەبینێتەوە، کە تاکەکان بەهۆیەوە بتوانن ببنە ئەندامی کاریگەرو بونیاتنەرو

---

٣٨ د. حەبیب کەرکووکی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤-١٦.

٣٩ مەجید سالح، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٩-٩١.

٤٠ قەرەنی قادری، کۆمەڵگەو ئامرازی ڕاگەیاندنی گشتی، سلێمانی، چاپخانەی دیار نیە، ٢٠٠٩، ل٣٦-٣٧.

٤١ د.حەسەن عیماد مەکاوی- د.سامی ئەلشەریف، مصدر سابق، ص١٢٩

٤٢ صالح خليل ابو اصبع، الاتصال والاعلام في المجتمعات المعاصرة، عمان، دار ارام للدراسات والنشر، ١٩٩٥، ص ١٠٥.

لەکۆمەڵگەکانیدا بژین و، بەشداری لە هۆشیاری کۆمەڵایەتی و کاری بەکۆمەڵ و کێشەکانی کۆمەڵگەدا بکەن.

٨- خولقاندنی پاڵنەرەکان: راگەیاندن بەشداری لەهاندان و پاڵپێوەنانی جەماوەر دەکات بۆ بریاردانی باش و گونجاو کەتوانای خزمەتکردنی کۆمەڵگەی هەبێ، پاشانیش بەشداریکردن لە درێژەدان بەپرۆسەی کارلێکی کۆمەڵایەتی لەنێوان تاکەکانیدا.[٤٣]

٩- تێگەیشتن لە دیاردە و رووداوەکانی دەوروبەر.[٤٤]

١٠- رۆشنبیرکردن: بڵاوکردنەوەی زانیارییە مرۆڤایەتییەکان رۆشنبیری خوێنەر دەوڵەمەندتر دەکات.

١١- ئەرکی پێشخستن و هاوچەرخکردنی کلتورەکان: کەناڵەکانی راگەیاندن لەکۆنەوە تاکو ئێستا ئەرکی گەیاندنی کلتوورو دابونەریتەکانیان لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیتر لەئەستۆدا بووە.

---

٤٣ د.حەبیب کەرکوکی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤-١٦.

٤٤ صالح خلیل ابو صبع، مصدر سابق، ص١٥٤.

## پاری دووەم:
## هۆشیاریی سیاسی و رۆڵی راگەیاندن لە گەشەکردنیدا

### یەکەم: چەمك و پێناسەی هۆشیاریی و هۆشیاریی سیاسی:

زۆر ئەستەمە شێوازێك یان تایبەتمەندییەکی دیاریکراو بدەین بە هۆشیاری، بەشێوەیەك لێی تێبگەین کە مانایەکی دیاریکراو بەدەستەوە بدات، کە بتوانین بەچاو بیبینین.[٤٥]

هۆشیاریی (consciousness)، هێزێکی بڕیارییە کە ئامادەبوونێکی درکپێکردنی هەیە بۆ هەڵبژاردن و دەرهێنانی راستی و رەخنەگرتن لە ئامرازەکان و دیاردەکانی واقیع.[٤٦] هۆشیاری زانینە ناسینە، هەستپێکردن و پێزانینە، تێگەیشتن و ئاگادارییە، دانەوەی ژیانی دەوروبەری کۆمەڵایەتی و سروشتە لە مێشکی مرۆڤدا لەرێگەی هەستەکانیەوە. هۆشیاری بە خۆی کەرەستە نییە، بەڵام کردەو ئەرکی بەرزترین و ئاڵۆزترین رشتی ئەندامی لەشی مرۆڤە کە ئەویش مێشکە.[٤٧] هۆشیاری پەیدا کراوەو رەچەڵەکی نییە. و بە دوو شێوە پەیدا دەکرێ: بە تاقیکردنەوەو شارەزایی پەیداکردنی خۆ لەژیاندا. لەگەڵ وەرگرتنی بەرو بەرهەمی تاقیکردنەوەو شارەزایی کۆمەڵی کۆمەڵانی مرۆڤایەتییە بە وەرگرتنی زانیاری لە رێگەی هۆیەکانی رۆشنبیرییەوە.[٤٨]

---

٤٥ محمد عبدالواحد حجازی، الوعي السياسي فی العالم العربي، الاسکندرية، دار الوفاء لدنيا الطباعة والنشر، ٢٠٠٧، ص ١٥٤.

٤٦ المصدر نفسه،ص١٥٥.

٤٧ فوئاد تاهیر سادق، هۆشیاریان، سلێمانی، چاپخانەی ئەژین، ٢٠٠١، ل٧.

٤٨ فوئاد تاهیر سادق، هۆشیاری رامیاری، سلێمانی، چاپخانەی ئۆفسێتی روناکبیری، ٢٠٠٠، ل٣٧.

هۆشیاریی "بریتییە لەئاراستەبوونێکی شکاوەی ئاوەز، توانا دەبەخشێ بە تاکەکەس کە پەی بەخودی خۆی بەرێت، لەگەڵ پەیبردن بەو ژینگەیەی کە دەوری داوە بەو کۆمەڵەی وەك ئەندامێك سەر بەوانە".[49]

هەروەها بریتییە لە فۆرمگرتنی ئەو هزرو بیرو بۆچوون و تێگەیشتنەی مرۆڤ، سەبارەت بەژیانی دەوروبەری لەئاستە جیاوازەکاندا.[50]

بەڵام هۆشیاری سیاسی چەمك و رێکخستن و پێرۆی رامیارییە، تێگەیشتنی نیازو شێواز و کارو پەیوەندییە رامیارییەکانە، ئاگادارییە لەبارەی رامیاریی ناوخۆو دەرەکی، زانینی تاکتیك و ستراتیجی رامیارییە، پێزانینی بەرنامەو نەخشەی رامیاری بیانییە بە دۆست و دوژمنەوە، شارەزاییە.[51] لەبارەی پێرۆیە رامیارییەکان و دەستوورەکانیان، زانینی ئەو راستییەیە کە دامەزرانی لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی و ئابوورییە، شارەزای ئەرك و مەرجەکانی دیبلۆماتە، پێزانینە کە دروشم و پەیمان و بەرنامەی رامیاری بەجێ ناگەیەنێ.

هۆشیاریی سیاسی تێڕوانینێکی گشتگیرە، زانیاری و بەهاو ئاراستە سیاسییەکان لەخۆدەگرێ، وا دەکات مرۆڤ هەست بە بارودۆخ و گرفتەکانی کۆمەڵگا بکات، هەروەها شییان بکاتەوەو بڕیاریان لەسەر بدات و هەڵوێستیان لەبارەوە دیاری بکات، هەروەها پاڵی پێوە بنێت هەستێ لەپێناو گۆڕان و پەرەسەندنیان.[52]

هۆشیاریی سیاسی دەرککردنی تاکە بەواقعی کۆمەڵگایی و هەرێمی و نێونەتەوەیی، ناسینی سروشتی هەلومەرجی سیاسی و پێڕۆو دامودەزگای سیاسی و پەیوەندییە سیاسییەکانە، ئاشنابوونی تاکە بە کێشە جۆراوجۆرەکانی

---

٤٩ أ.د. تاهیر حەسۆ زێباری، رۆڵی هۆکارەکانی راگەیاندن لە گەشەپێدانی هۆشیاری سیاسی و بەشداریکردنی سیاسی لەلای لاوانی زانکۆ، لێکۆڵینەوەی مەیدانی زانکۆی سەلاحەددین، کۆلێجی ئاداب- بەشی کۆمەڵناسی، بلاوکراوەی لاوان، ژمارە تایبەت، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٣.

٥٠ چنار سەعد عەبدوڵا، کاریگەری باری سیاسی لەسەر گەشەکردنی هۆشیاری نەتەوەی کورد دوای راپەڕینی ١٩٩١، هەولێر، چاپخانەی رۆشنبیری، ٢٠٠٥، ل ١٨٧.

٥١ فوئاد تاهیرسادق، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٤.

52 www.4shared.com\file\19194350430\4ace8dua\...online.html

سـەردەم و ئـەو هێزانـەی کاریگـەریان لەسـەر بڕیارسـازی نیشـتمانی و سیاسـی جیهانی هەیە، پێزانینی دەستوری وڵاتان و مەرجەکانی دیبلۆماتە.

هۆشیاری سیاسـی: بریتییـە لـە هەسـتی تـاك بەرامبـەر بـەو دیفاکتۆیانـەی لـە کۆمـەڵگاو گـوزەرانی ژیـانی ئیقلیمـی و نێونەتەوەییـدا ڕوودەدات و سـەرەڕای زانینـی سروشـتی دۆخـی سیاسـی و جڤـاکی و ئـابووری کەلـە چوارچـیوەی ژیانیـدا تێپـەڕ دەبێـت، هەڵوەسـتەو شـرۆڤەی بەرامبـەر کێشـە و تەگـەرەکانی کـە لەچوارچێوەی ڕەهەندە سیاسییەکاندا ڕوودەدات.

هۆشـیاری بەگشـتی بـەبێ هۆشـیاری سیاسـی، کەموکورتـە، بـێ ئاگـایی لـەبارەی بـیرو کـاری سیاسـی، لـەبارەی ڕێکخـراوو دەسـەڵات و پـیرۆی سیاسـی، نەزانینە لەبارەی کردەوەو پەیوەندییە سیاسییەکاندا.[٥٣]

هۆشـیاری سیاسـی شـێوەیەك لـە شـێوەکانی هۆشـیاری کۆمەڵایـەتی پێکـدێنێ، کـە تێگەیشـتنی بـوونی کۆمەڵایـەتی بـە واتـا فراوانەکـەی دەگرێتـەخۆ بـە تێگەیشـتنی تـاك لـە خـودی خـۆیی و ناوەنـدە کۆمەڵایەتییەکـەی دەوروبەریشـیەوە. لەبەرئـەوەی سیاسـەت بـە پلـەی یەکـەم کردارێکـی کۆمەڵایەتییـە، بـەم پێیـەش سیسـتەمی سیاسـی لەبنەڕەتـەوە لەسـەر بنـەمای ڕێکخسـتنی ژیـانی ئەنـدامانی کۆمەڵگـە سەرچـاوە دەگـرێ یـاخود دادەمـەزرێ، پێویسـتە پاڵپشـتییەك هـەبێ لـەنێوان سیسـتەمی سیاسـی و ئەنـدامانی کۆمەڵگـە. ئـەم پاڵپشـتییەش بـە پلەیـەکی دیـاریکراوی هۆشـیاری سیاسـی نـەبێ نایەتـەدی کـە بەشـبەحاڵی خـۆی دەبێتـە مایـەی دۆخێکـی مـانگرتن لـە بەشـداریکردن لـە کـاری سیاسـی لای هاوڵاتی.[٥٤]

هەروەها هۆشیاری سیاسـی بریتییـە لـە درکپێکردنـی تـاك لـە واقعـی کۆمەڵگـە و ناوەنـدی هـەرێمی و نێودەوڵـەتی و، زانینـی سروشـتی بـارودۆخی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و ئـابووری کـە دەوری داوە (لـەو ناوەنـدەدا) و، زانینـی کێشـە

---

٥٣ فوئاد تاهیر سادق، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٠.

٥٤ شێرزاد ئازاد سلطان ، کاریگەری هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر ڕەفتاری سیاسی، لێکۆڵینەوەی مەیدانی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، کۆلێژی ئەدەبیات، ٢٠٠٧، ل ٣٠.

جیاوازە هاوچەرخەکان و، زانینی هێزی کاراو کاریگەر لە دروستکردنی بڕیاری نیشتیمانی و نێودەوڵەتی.[55]

هۆشیاری سیاسی هۆشیاری هاولاتییە بە مافە سیاسییەکانی خۆی، مافی لەژیانداو لە خاوەندارێتیداو لەبیرکردنەوەداو، لە دەربڕینی بیروبۆچوونی خۆی و، مافی لەوەی وەك ئامانجێك مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، نە وەك ئامرازێك بۆ بەدەستهێنانی ویستی کەسانیتر، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسانە فەرمانڕەوایانیش بن و، مافی لە کەرامەت و ڕێز لێگرتنی...هتد. ئەم هۆشیارییە سیاسییە لە سیستەمێکی سیاسی باشدا نەبێ گەشە ناکات.[56]

بۆچوونێکی تر پێیوایە هۆشیاریی سیاسی بریتییە لە (کۆی ئەو کردارە عەقڵیانەی کە بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە بەشداری دەکات لە تێگەیشتنی مرۆڤ بۆ جیهانی واقع، هەروەها تێگەیشتن لە بوونی تایبەتی خۆیی و ئەو بەرچاوڕوونییەی کە هەیەتی بۆ پرۆسەی سیاسی و بوارە جۆراوجۆرەکان لە ژیانی سیاسیدا).[57]

یەکێك لە پێناسەکانی تری هۆشیاری سیاسی بریتییە لە "شێوازێك بۆ ڕوانین لە شتە گرنگەکان و کردارەکان لەجیهاندا، بەشێوەیەك کە سازانێکی هەبێت لەگەڵ بەڵێنەکانی مافی مرۆڤ، دادپەروەری و تێگەیشتن لە گروپە خاوەن هێزەکان، مرۆڤ تێگەیشتنی هەبێ بۆ نایەکسانییەکانی کۆمەڵگا لە سیستەمەکانی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیدا لە چوارچێوەی بەهاو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، کە ئەمەیان پەیوەندی بە ڕەفزکردنی زوڵم و ئەو دەزگا بونیاتیانەی کە مومارەسەی زوڵم دەکەن هەیە، کەچی ئەوە ڕەفز کردنی تاکەکان نییە، بەڵکو هونەری ڕێزگرتن لەوانیترو کارکردن لەگەڵیان و سەیرکردنی مرۆڤەکانیتر بەوەی کە لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی جیای دەکەنەوەو

٥٥ د.امام عبدالفتاح امام، الديمقراطية والوعي السياسي، القاهرة، شركة نهظة القاهرة، للطباعة والنشر والتوزيع، ٢٠٠٦، ص ١٠٤.

٥٦ د.امام عبدالفتاح امام، مصدر سابق ص ١٠٤.

٥٧ چنار سەعد عەبدوڵا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٧.

پەیوەستییەکی ململانێی بەوانیەوە دەبەستێتەوە لەپێناو بەدەستهێنانی پێگەکی ریز لێگیراو". [58]

لەسەر ئەم پێناسانەی پێشتر دەتوانین هۆشیاری سیاسی وا پێناسە بکەین کە، بریتییە لەو گرنگیدان و زانینەی کە مرۆڤ یان ئەندامی کۆمەڵگە یاخود ئەندامی گروپە کۆمەڵایەتییەکان هەیانە سەبارەت بەو بابەتانەی پەیوەندیان بە کایەی سیاسیەوە هەیە، بەوپێیەی سیاسەت رۆڵێکی گرنگ دەگێرێ لە ژیانی تاك و گروپە کۆمەڵایەتییەکان. [59]

### دووەم: هۆشیاریی سیاسی (consciousness policy):

بەهۆی ئەوەی زۆرینەی نەتەوەکەمان نەخوێندەوارن، نەك هەر ئاستی رۆشنبیریان، بەڵکو هۆشیاریان بەگشتی و لەوانە هۆشیاری سیاسییان نزمە، بەڵام ئەو کوردانەی لە مەیدانی سیاسی کار دەکەن چ بەهۆی پەیداکردنی شارەزای و کارامەیی یان لەڕێی وەرگرتنی پسپۆڕی لە زانکۆکاندا بەشێکیان هۆشیاری سیاسی باشیان پەیدا کردوە. [60]

زۆرێك لە تاکی کوردی بەهۆی باری ژێردەستی و چەوسانەوەو رۆژانە ناخۆشی و ستەم لەدەست داگیرکەرانی کوردستان، بەحەزو بێ حەز، ناچار بایەخ بە سیاسەت دەدەن. بەهۆیەوە بەشێکی کورد لە رەوتی بەسەرهات و رووداوە سیاسییەکان، چاودێریکردن و بەدواچوونی گۆڕانەکان، توانای سیاسییان پەیدا کردووە. [61]

دەڵێین هۆشیاری سیاسی بەو واتایەیە کە هاولاتی ماف و ئەرکە سیاسییەکانی خۆی بزانێ، هەروەها بزانێ کە چ دەگوزەرێ و رودەدات لەدەوروبەری و، ئەو هاولاتییە توانای وێنابینییەکی گشتگیری هەبێ بۆ واقعی دەوروبەری وەك

---

58 یاسر رەفعەت، .http/www. Alhour.maktoobblog.com

59 هەمان سەرچاوە

60 أ.د. طاهر حسو مير زيباري، دور المرأة الكردية في المشاركة السياسية، اربيل، مؤسسة ئاراس، ٢٠٠٦، ص ٣٤.

61 أ.د. طاهر حسو مير زيباري، دراسة في المجتمع الكردي المعاصر، اربيل، مطبعة حجي هاشم، ٢٠٠٨، ص ٩٣.

راستییەکی گشتی کە توخمەکانی ئەو واقعە پابەستی یەکترین نەك لێکەوتە (وقائع)ەکانی پەرش و بڵاوو لێکجیابن، ئەم هۆشیارییە سیاسییەش دەوەستێتە سەر ئاستی گەشەکردویی هۆشیاریەکەی، هۆشیاری وەك تێرم بریتییە لە ئاراستەیەکی عەقڵی پێچەوانەیی کە (تاك) دەتوانێ درك بە خودی خۆی بکات، هەروەها درك بە ژینگەی دەوروبەری ئەو گروپەیە بکات کە ئینتمای بۆی هەیە وەك ئەندامێکی ئەم گروپە، کەواتە چالاکییەکانی پەیوەندیکردن هاوکاری تاك دەکات کە روانینی بۆ خۆی هەبێ و هەست بە گێڕانی رۆڵی ئەوانیتر بکات و لێکدانی ئەو چالاکیانە گوزارشتە بۆ ئەوانیتر، یاخود نوێنەرایەتیکردنی دۆخی دەوروبەر مەرجێکی بنچینەییە بۆ دەرکەوتنی هۆشیاری.[٦٢]

## سێیەم: گەشەکردنی هۆشیاریی سیاسی:

گەشەکردنی هۆشیاریی سیاسی لەلایەن مرۆڤ دادەنرێ لە ماوەی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی بۆیە بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و، لە میانەی کاری بەرهەمهێنان و ئامادەکردن و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و لە ماوەی کارلێککردن لەگەڵ سروشتدا مرۆڤ دەتوانێت هۆشیاربێتەوەو خاسیەتی شتەکان بزانێ و جیاوازی بکات لە نێوان ئەوەی بە بەهایەو ئەوەی کە بێ بەهایە، هەروەها پەیوەندی خۆی دروست بکات لەگەڵ ئەو ژینگەیەی کە تیایدا دەژی و، گەشەکردنی هۆشیاری سیاسی لەلایەن مرۆڤەوە بە پلە یەك و بەشێوەیەکی گشتی دەبەسترێتەوە بە سەرهەڵدانی زمان. زمان یاخود دروستبوونی زمان شوێنەوارێکی زۆری بەسەر دروست بوون و پێشکەوتنی هۆشیاری هەبووە، وەکو کە لە رێگەی زمانەوە گفتوگۆ لەنێوان مرۆڤەکانەوە پەیدا بووە بە درێژایی مێژوو. هەروەها شارستانیەتی مرۆڤایەتی

---

٦٢ مهدی محمد القصاص، دور المجتمع فی تنمیة الوعی السیاسی وتحقیق، الحکمة الراشد دراسة،لە رێگەی تۆری ئینتەرنێتەوە www.mandyelkassas.name.

بـە هـەموو شـێوەکانیەوە کاریگـەری هـەبووە لـە دروسـتبوونی هۆشـیاری سیاسـی لەنێو میللەتاندا.[٦٣]

مەبەسـت لـە هۆشـیاریی وەك چـەمكێك، ئەوەیـە، بریتیـە لـە ئاراسـتەبوونێکی شـکاوەی ئـاوەز، توانـا دەبەخشـێ بـە تاکەکـەس کەپـەی بـە خـودی خـۆی بـەرێ، لەگـەڵ پـەی بـردن بـەو چـینەی کـە دەوری داوەو بەوکۆمەڵـەی کـەوەك ئەنـدامێك سەربەوانە.

"جـۆرج هربـەرت میـد" پێشـەنگی قوتابخانـەی کـارلێکی هێماگـەری (التفاعلیە الرمزیـە)ش وای بـۆ دەچـێ، کردارەکـانی بەیەکگەیشـتن یارمـەتی تاکـە کەس دەدەن بـۆ لـە خـۆڕوانین و ئەنجامـدانی رۆڵـی خـەڵکیتر، کـرداری خۆلکانـدن بـە خـەڵکیتر یـان چـوونە ژێـر بـاری بـارودۆخی دەوروبـەر، بـە مـەرجێکی بنـەڕەتی دادەنـرێ بـۆ دەرکـەوتنی هۆشـیاری هەرچـی هۆشـیاری سیاسـییە، مەبەسـت لێـی کـرداری پـەی بـەخۆبردنی تاکـە، وێـڕای پـەیبردن بـە بـارودۆخی سیاسـی دەوروبـەرو پێکهێنـانی بۆچـوونێکی عـەقڵ ئـامێز لـەڕووی دۆزە گشـتییەکانی کۆمەڵگـەدا مارکسـیەتیش زاراوەی هۆشـیاری چـینایەتی بـەکارهێناوە بـۆ ئامـاژەپێکردنی پـەی بەخۆبردنی تاك و بەرژەوەندیی چینە کۆمەڵایەتییەکەش.[٦٤]

**چوارەم: هۆکارەکانی بەرزکردنەوی هۆشیاریی سیاسی:**

چـەند هۆکاریـك هەیـە کاریگـەری و رۆڵـی سـەرەکەیان هەیـە لەبەرزکردنـەوەی هۆشیاریی سیاسی:[٦٥]

١. ئاسـانکاری گەیشـتنی هەڵوێسـتی سیاسـی کۆمەڵـەکان بـۆ تاکـەکان، داتاکان و گفتۆگۆ.

٢. پێشکەشـکردنی دەرخسـتە گشـتییەکان بـۆ دۆزە سیاسـییەکانی و گەیشتنیان بە تاك (لۆکاڵی...، نەتەوەیی...، ئینترناسیۆنالی..).

---

٦٣ زیرڤان سلیمان البرواری، مصدر سابق، ل ٤٥

٦٤ أ. د.طاهیر حەسۆ زیباری، مصدر سابق، ل٩٠

٦٥ یاسر رفعت، مصدر سابق، ص١٢

٣. هانـدان بـۆ بەدواداچـوون و سـەیرکردنی ئامرازەکـانی راگەیانـدن و داتـاکردنی ئەو دەرئەنجامانەی وەدەست هاتوون لەماوەیەکی دیاریکراودا.

٤. دروستکردنی ئەرشیفێکی گرنگ بۆ دوزە سیاسی و کۆمەڵەکان.

٥. تایبەتمەنـدکردنی چـەند تاکێـك بـۆ بەواداچـوونی چـەند دۆزێـك و پرۆفیشـناڵ بوون تیایدا.

٦. پشـت بەسـتن بەدانووسـتان وەکـو هۆکارێـك بـۆ گەشەسـەندنی هۆشـیاری سیاسی.

٧.تێکـەڵبوون بـە کەسـانی خـاوەن شـارەزایی و پرۆفیشـناڵی لەرێگـەی سـەردان و چاوپێکەوتنەکان لەناوەوەو لەدەرەوەی کۆمەڵ.

٨. هانــدان بــۆ پەیوەنــدیکردن بــە هۆکارەکـانی راگەیانــدن و رای جیــاوازی پێشیان ئەمەش مانای گەشەسەندنی هۆشیاری سیاسییە.

٩. تایبەتمەنـدکردنی چـەند تاکێـك بـۆ ئامـادەکردنی تۆیژینـەوەی جیـاواز لـە ئاستە سیاسییە جیاوازەکان بەمەبەستی گەشەپێکردنی هۆشیاری سیاسی.

١٠. بەشـداریکردن لـە ۆرکشـۆپە جیاوازەکـان کـە ئاسـتی مـەعریفی تـاك بـەرز دەکاتەوە.

## پێنجەم: توخمەکانی هۆشیاری سیاسی:

هۆشـیاریی سیاسـی وەکـو هـەموو ئامرازەکـانی تـری سیاسـی چـەند تـوخمێکی هەیە بۆ زانینی ئاستی هۆشیاریی خەڵك لەوانە:[٦٦]

---

٦٦ یاسر رفعت، Alhour.maktoobblog.com.http/www /

١. هۆشیاریی پەیام:

بۆچوونی تاك بەرمبەر كۆمەڵگەو پەیامی تەواوی جیهان لەمیانەی تێگەیشتنی تەواوی ئیسلام (وەك ئایین) و، پێویستی بۆ جێبەجێكردنی بنەماكان لەرێگەی تێگەیشتنی دەقەكانی (قرأن و حدیث)، پاشان تێگەیشتنی دیفاكتۆی ژیان بۆ تەواوی كاروباری مرۆڤ.

٢. هۆشیاریی بزووتنەوەیی:

بۆچوونی تاك بەرامبەر رێكخستنە جیاوازەكان (پارتی سیاسی، بزووتنەوەی سەلەفی، تەریقەتێكی سۆفیزمی، هزرێكی جڤاكی) بۆچوونێكی چەسپاو + گۆڕاو.. و سەرەڕای ئامانجەكان و هۆكارە جیاوەزەكان.

٣. هۆشیاریی بە بارودۆخە سیاسییەكان:

بۆچوونی تاك بەرامبەر هەڵوێستە سیاسییەكان سەرەڕای پێشكەوتنەكانی لەهەموو ئاستە جیاوازەكان و جیاكردنەوەی هێزە سیاسییە كاریگەرەكان لە گۆڕەپانی كاری سیاسیداو زانینی سەرچاوەی ئەو هێزانە.

٤. هۆشیاریی بە هەڵوێستی سیاسی:

بۆچوونی تاك بەرامبەر بارودۆخە سیاسییەكان و بەرەو پێشچوونەكان لەهەموو ئاستە جیاوازەكان و دیاركردنی هێزە سیاسیە كاریگەرەكان و زانینی سەرچاوەی هەر یەكێك لەوانە.

**شەشەم: گرنگی هۆشیاریی سیاسی:**

تەواو كاملبوونی هۆشیاری سیاسی لە كۆمەڵگا پێشكەووتوەكاندا دەتوانێ گۆڕانی مەزن بكات لە بواری رۆشنبیری و سیاسی و كۆمەڵایەتی ونەمەش وادەكات هۆشیاری سیاسی تاك پێرفێكت بێت. لەو بوارەدا گرنگترین سەرچاوەكانی گەشەكردنی هوشیاری سیاسی بریتییە لە ماسمیدیا (هۆكارەكانی راگەیاندن بەهەموو جۆرەكانیەوە) جا سەربەخۆ یان لایەندار بێت. هەروەها

ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی بەهەموو پسپۆرییەکانیانەوە لەم بارەدا ڕۆڵی کاریگەرو بەرفراوانیان هەیە.

نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێت کە خودی تاك سەنتراڵی گۆڕانگارییەکانە، بۆیە دەبێ تاك هەوڵی خۆرۆشنبیرکردنی بدات لەڕێگەی خوێندنەوەو بەدواداچوونی بۆ سەرچاوەکانی کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤارەکان و بەشداریکردنی لە خول و سیمینارە سیاسییەکان. بەهەمان شێوەش بەشداریکردنی تاك لەپرۆسە سیاسییەکاندا وەکو شێوەی بەشداریکردنی لە پرۆسەکانی هەڵبژاردن ودەنگدان ئاستی هۆشیاری تاك بەرز دەکاتەوەو، هێزی نوێ لای تاك گەڵاڵە دەکات و جارێکیتر ڕونیای سیاسی تاك سەرلەبەری نوێ دەکاتەوە، ئەمەش ڕاستەوخۆ خزمەت بە بەرەوپێشچوونی پرۆسە و کاری سیاسی و دیموکراسی لە وڵاتدا دەکات.

گرنگی هۆشیاری سیاسی لەکۆمەڵگە تازە فراژووبووەکاندا لەوێدا ڕەنگدەداتەوە کە ڕوئیای تاك بۆ دۆزەکانی گەل و کۆمەڵگای خۆی شرۆڤە بکات و هەوڵی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی بدات لەڕێگای پراکتیزەکردنی ئەرك و مافەکانی لە خودی سیستەمی حوکمڕانیدا.[٦٧]

گرنگی گەشەکردنی هۆشیاری سیاسی بۆ چینی گشتی دوای سەرکەوتنی دیکتاتۆری پرۆلیتاری دیاری دەکرێ بە کێشەی نوێ کە لە ململانێی چینایەتی دروست دەبێ و خەڵك پێویستە کاری نوێ بکات بۆ هۆشیاری و دەوڵەت دەبێ سۆشیالیزم بنیاد بنێ، ئەویش هۆشیاری خەڵك بە سەرچاوەی سەرەکی هێزی خۆی دادەنێ و، ئەم هۆکارانە دەبنە هۆی هۆشیاری کۆمەڵگا، گرنگی گەشەکردنی هۆشیاری سیاسی بۆ چینی گشتی دوای سەرکەوتنی دیکتاتۆری پرۆلیتاری دیاری دەکرێ بە کێشەی نوێ کە لە ململانێ ی چینایەتی دروست دەبێ و، خەڵك پێویستە کاری نوێ بکات بۆ هۆشیاری و دەوڵەت دەبێ سۆشیالیزم بنیاد بنێ.[٦٨]

---

٦٧ ناجي الحزي، مصدر سابق، ص ١٣

٦٨ أ.ك. أوليدوف، الوعي الاجتماعي، ت: ميشيل كيلو، بيروت، دار ابن خلدون، ١٩٧٨، ص٧.

**حەوتەم: دیموکراسی هۆشیاریی سیاسی:**

یەکێك لەو ئاستەنگانەی خۆرهەڵاتی ناوین دووچاری هاتووە لەگەڵ رۆشنبیری خۆرئاوا بەتایبەت لە چەرخی نۆزدەدا، بریتییە لەهاوگونجان و نەگونجان لەگەڵ دیموکراسیەتدا. بگرە دیموکراسیەت وەك چەمك و فکری یەکێك بووە لەبەهێزترین ئەو وێستگانەی مشتومڕی زۆری لەسەر کراوە لەم ناوەندەدا. لەم سۆنگەیەوە چەند هەوڵێك هەیە بۆ رەتکردنەوەو ناشیرینکردنی دیموکراسیەت، هەروەها چەند هەوڵێك هەبووە بۆ گۆڕین و سەرو بنکردنی دیموکراسیەت چ وەك چەمك و چ وەك فیکر.

هاوزەمان چەند هەوڵێکی ترسناکیش هەیە لەم نێوەندەدا بەمەبەستی گواستنەوەی دەقاودەقی دیموکراسیەت بەشێوە ئەوروپییەکەی بۆ ناو کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی. بۆیە زۆر راو بۆچوونی جیا جیا هەبوون لەمەر دیموکراسیەت چ وەك چەمك و میتۆد چ وەك فکرو پراکتیك.

دیموکراسیەت ئامانج نییە، بەهەمان شێوەش دەق ودەق هۆکار نییە، بەڵکو بریتییە لە شێوازو مۆدێلێك بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی جڤاکی مرۆڤەکان بەگوێرەی کۆمەڵێك پێڕاو بنەما، کە تیایاندا سەلامەتی و هێمنی ژێرخانی جڤاکی دەپارێزرێ. هاوزەمان دیموکراسیەت چەمکێکی سیاسییە، لەبنەچەدا بە دەسەڵات بەستراوەتەوەو، هەمیشە بەدەست زۆرینەوەیە و کەشوهەوا دەگونجێنێت بۆ دەستاودەستکردنی دەسەڵات.[69]

لە کۆمەڵگای دیموکراسی شارستانیدا هاووڵاتیان هەست بە پێگە و تواناکانیان دەکەن و هاووڵاتیان وا مامەڵە لەگەڵ فەرمانڕەواکان دەکەن وەك ئەوەی بریکاریان بن، لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات لەسەر کارەکانیان و، توانایان دەبێ لە هەر کاتێکدا کۆتایی بەو بڕیارە بهێنن.[70]

---

٦٩ یاسر رفعت، مصدر سابق،ص ١٥

٧٠ سیعد الجراح، الرأي العام مقوماته و اثره في النظم السياسية المعاصرة، القاهرة، الهيئة المصرية للكتاب، ١٩٨٦، ص ١١٢.

لەچوارچێوەی زانستی سیاسەتە جیاوازەکان، کەموکورتییەکە ئەوەیە لە شێوەی رۆشنبیری سیاسی دەتوانین روون بکەینەوە زیاتر لە ئامادەبوونی دیموکراتی و بە بەردەوامبوونی بۆمان روون دەکاتەوەو، جەخت دەکات کاریگەری پێشکەوتووە سەبارەت بە دیموکراتیەت و کلاسیکی کۆن و نوێ و دیموکراتیەت داوا دەکات لە کۆمەڵەیەك تایبەت لە گەلەکەی و بەرەنگارییەکانی سیاسەت، وەکو لێخوشبوون، سۆزو راستگۆیی و پەیوەندییەکان و بیرو بۆچوونەکان بەپێی راستی شێوازەکان و تواناکان بۆ تێگەیشتن و دەربڕین بەبەردەوامی سەرچاوەکە بۆ گۆڕینی یاساکە و، کاریگەری دەبێ بەشێوەیەکی تایبەت لەسەر بەردەوامبوون دیموکراتی و تێکچوونی.[71]

بەلام دیموکراسیەت نەیتوانیوە ببێتە چارەسەر بۆ هەندێ کێشە و ئاستەنگ بەتایبەت لەسەردەمە سەرەتاییەکاندا. بۆ نموونە شارنشینی یۆنانی گیری خواردبوو لە دەست دیموکراسیەت پاشماوە کۆمەڵایەتیەکانی، هاوکات بیرو بۆچوونی فەیلەسوفەکانی ئەوان هەوڵیدەدا سیستەمێك بدۆزێتەوە بەدەر لەسیستەمی دیموکراسیەت و لایەنە سلبیەکانی، بۆ وەدەستهێنانی کامەرانی و خۆشبەختی دانیشتوانی. بەلام بەختەوەری کۆمەڵگا لەوێدا کامڵ نابێ کە کۆمەڵێك خەڵك دەسەڵاتسالار بن بەسەر هەندێکیترو فەرمانڕەواییان بکەن ئەگەرچی خاوەن هزرمەندیش بن، لەئازادیشدا هەڵە دەکرێ و ئەم هەڵەکردنەش ئازادانە دەبێ و لەدەرئەنجامی ئەم ئەزموونانەش کۆمەڵگاو تاك فێری کۆمەڵێك وانەی زیندوو دەبێ بەدرێژایی مێژوو.

دیموکراسیەت توانیویەتی دەسەڵات بۆ گەل بگەڕێنێتەوە پاش ئەوەی تەواوی مرۆڤایەتی تاقیکردنەوە، هاوزەمان دەسەڵاتدارن زۆر بوون بۆ فەراهەمکردنی دەسەڵاتی رەها بۆ خۆیان کە بەردەوام لە کێبڕکێی دیموکراسیەتدا بوونە.[72]

---

٧١ لاری دایموند،مصادر الدیموقراطیە،ت: سمیە فلو عبود.بیروت، دار الساقي،١٩٩٤، ل ١٠

٧٢ د.امام عبدالفتاح امام، الدیمقراطیة والوعي السیاسي، القاهرة، شركة نهضة مصر للطباعة و النشر والتوزیع، ٢٠٠٦، ص ١١٤.

لەکۆمەڵگای دیموکراتی شارستاندا هاوڵاتییان هەست بە پێگەو تواناکانیان دەکەن و وا مامەڵە لەگەڵ فەرمانڕەواکان دەکەن وەك ئەوەی بریکاریان بن، لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکەن لەسەر کارەکانیان و توانایان دەبێ لەهەر کاتێکدا کۆتایی بەم بریکارییە بهێنن، ئەو کۆمەڵگایانەی لەئاستێکی گونجاوی ئابووری پێشکەوتنی کۆمەڵگە و گشت دامەزراوە پەروەردەو فێرکردن و زانکۆکان و خانەی وەشاندنیان دەستەبەرکردووە کە بەشداری دەکات لە بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئەمەش بەشبەحاڵی خۆی دەبێتە هۆی هاتنەکایەی ژمارەیەکی زۆر سیاسەتمەداری خاوەن تواناو چوستی و رۆشنبیریی سیاسی.

لێرەدا جەماوەر دەتوانێ بە شێوازێکی دیموکراسی بەشداری بکات لە کرداری بڕیاردان.[73] بەڵام لە وڵاتە هەژارو دواکەوتووەکاندا دامەزراوەی فێرکردن و رۆشنبیرکردن و رۆشنبیریان نییە، ئەگەر بێن دایبمەزرێنن ئەوا پێویستی بە دابینکردنی پارەو سەرچاوەی زۆر دەکات کە بۆیان نالوێ.[74]

هۆشیاری سیاسی تاکە رێگایە تیایدا تاك ئەرك و مافەکانی خۆی پێ جیادەکاتەوە لە هەموو سیستەمەکانی حوکمڕانی جاچ سیستەمەکە دیموکراسی بێت یان پرۆلیتاری. ئەو کۆمەڵگایانەی دەیانەوێ بگۆڕدرێن لە رژێمێکی دەسەڵاتسالاری دیکتاتۆری بۆ سیستەمێکی دیموکراسی پێویستیان بە کۆ چەمکی سیاسییە جۆربەجۆرەکان دەگرێتەوە، تیایدا تاك راستەخۆ هەست بە بەرپرسیاریەتی سیاسی خۆی دەکات لەناو کۆمەڵگادا، هەوڵدەدات بەشدار بێت لە گەشەکردن و بە دامەزاوەییکردنی کۆمەڵگەکەی و گۆڕانی، بۆیە ئەرکی تاك گرنگە و جێگای هەڵوەستەکردنە کە پێویستە هەست بەبەرپرسیارێتی بکات.[75]

---

٧٣ شیرزاد ئازاد سلطان، کاریگەری هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر رەفتاری سیاسی، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین، کۆلیژی ئەدەبیات، هەولێر، بەشی کۆمەڵناس، ٢٠١٠_ ٢٠١١، ل٣٢.

٧٤ د. صادق الاسود،علم الاجتماع السياسي: اسسه وابعاده، بغداد، دار الحكمه **للطباعة**، ١٩٩٠، ص٢٤١.

٧٥ **د.امام عبدالفتاح امام، مصدر سابق، ص ١١٤.**

## هەشتەم: چۆنیەتی پێوانەکردنی هۆشیاریی سیاسی:

هەر زانستێك چەند شتێکی دیارکراوی خوی هەیە بۆ پێوانەکردنی زانستی سیاسیش بۆ هۆشیاری سیاسی چەند خاڵێکی دیاریکراو هەن کە ئەمانەی خوارەوەیە:[٧٦]

١. بەرچاووڕوونی: جێبەجی دەبێ بەسەر کۆمەڵە تاکێك کە چەند پرسیارێکی روونکاری دەگرێتەخۆی بۆ دیاریکردنی قەبارەی مەعریفە سیاسییەکان.

٢ . پێوانەکردنی هەڵسوکەوتی تاکەکان لەچەند بارودۆخێکی سیاسی و بەشداریکردنی لە کۆبوونەوەو هەڵبژاردنەکاندا.

٣. پێوانەکردنی پەرۆشی بۆ بەدواداچوونی هۆکارەکانی راگەیاندن بەهەموو جۆرە جیاوازەکان

(تەلەفزیۆن و رادیۆو رۆژنامەو گۆڤارو ئینتەرنێت).

٤. پێوانەکردنی ئاستی دانوسان و پرسیارو بەدواداچوونەکان لە کاتی ورووژاندنی بابەتێکی دیاریکراو بۆ گفتوگۆ.

## سەرچاوەکانی هۆشیاریی سیاسی:

گرنگترین رێگا بۆدەستکەوتنی هۆشیاری سیاسی کە توانای شیکردنەوەی رووداوەکانی هەبێ و ئەکادیمی بێت و نوێنەر بێت لە دامەزراوە سیاسییەکان، چەند رێگایەك هەیە بۆ زانین ئەو رێگایانەش کە دەتوانرێ بەهۆیانەوە هۆشیاری سیاسی دەست دەکەوێ، ئەوانیش رۆڵی دامەزراوەیەکی سیاسی روون دەکەنەوە، لێرەدا جەخت دەکەینەوە لەسەر ئەو دامەزراوەی کە رۆڵێکی دیاری هەیە لە هۆشیاری سیاسی تاك و دابەش دەکرێتە سەر ئەم بەشانەی خوارەوە:

---

٧٦ د.محمد بالروین،(من اللاوعی _ الی الوعی السیاسی)، لە رێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە:
http:www.berweeen.com

١. خێزان:

بە یەکەم سەرچاوەو هۆکار دادەنرێ بۆ بەیەکگەیشتن لەگەڵ ژینگەیەکی سیاسی کە منداڵ دەست دەکات بە دەستکەوتنی هۆشیاری بە خودی خۆی وەك بوونەوەرێکی زیندوو، هەروەها دەستکەوتنی هۆشیاری سیاسی لەو ژینگەیە کۆمەڵایەتییەی تیایدا دەژی. گەشەکردنی سیاسی لە قۆناغی خێزان، هەوڵدانە بۆئەوەی بەشێوەیەکی سەرەتایی و ئاسان لەڕێگەی ناساندنی ڕەمزەکانی دەسەڵات و، هەندێ لەو شتانەی پەیوەندییان بە سیاسەتەوە هەیە بیخەنە مێشك و هزری منداڵەکانەوە، بێ ئەوەی ئەو منداڵە هیچ لەڕاستییەکانی سیاسەت و ڕووداوەکان و بارودۆخەکانی تێ بگات.

زانایەکی کۆمەڵایەتی فەرەنسی بە ناوی "دورکایم" ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە دایك و باوك و خێزان لە پەروەردەکردنی منداڵێکی سیاسی ڕۆڵێکی زۆریان هەیە، لەبەرئەوەی هەموو پێکهاتەکانی ڕۆشنبیری سەرەتایی لە خێزان و دایك و باوکدا هەیە، خێزان سەرەتایەکی سیاسییە و سەرەتایە کە بۆ پەروەردەیەکی سیاسی بۆ منداڵ، بەمەش لە زانستی دەروونی سیاسی منداڵ دەردەکەوێ.[٧٧]

چەند قۆناغێکی گرنگ هەیە لە ژیانی منداڵدا کە (دایڤد ئایستن) ئاماژەی پێ دەکات، بریتین لە:

١- قۆناغی بەسیاسیکردن: لەو کاتەی منداڵ هەست بە بوونی جیهانێکی سیاسی دەکات لەو ژینگە کۆمەڵایەتیەی کە تیایدا دەژی.

٢- قۆناغی کەسایەتی: لەو کاتەی کە منداڵ لەڕێگەی ئاشنابوونی یان زانیاری وەرگرتن لەسەر چەند کەسایەتییەکی سیاسی کە وەکو خاڵێکن بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ سیستەم، ئەم قۆناغەش بەشێوەیەکی دیارو ئاشکرا لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبینرێ کە لەوکاتەی منداڵ لەدایك دەبێ و لەو کاتەی گەورە دەبێ دەزانێ و دەبینێ کە گەورەیەك هەیە لەسەر دەسەڵات و

---

٧٧ د.صادق الاسود، علم الاجتماع السياسي، اسسه وابعاده، بغداد، دار الحكمة للطباعة، ١٩٩٠، ص ٤٣٨.

منداڵەکە دەگاتە تەمەنی دە ساڵان یان زیاتر لەگەڵ ئەو گەورەیەو هەمان ئەو شێوازەدایە لە دەسەڵات و باوەڕی پێی هەیە.

٣- قۆناغی پێکهێنانی بیرۆکەی دیاریکراو: کاتێك منداڵ لەڕێگەی هەندێ لە کەسایەتیەکانەوە دەڕوانێتە دەسەڵات ئەو تێڕوانینەی ئایا رازییە یان نارازییە و ڕەفزی دەکاتەوە و کاردانەوەی دیاری کراوی دەبێ.

دوای ئەم قۆناغە یان لە قۆناغەکانی تردا جۆرێك لە سەربەخۆیی دەست دەکەوێ لەو بیروباوەڕانەی کە لەو ژینگە کۆمەڵایەتی و سیاسیەدا هەیە. بەڵام کۆمەڵگا گۆشەگیرەکان زۆرجار دەسەڵاتی باوکسالاری دەبینرێ، ئەمەش لەڕێگەی فەرزکردنی جۆرێکی دیاریکراو لە باوەڕی بە خێوکەری خێزانەکە لە مێشکی منداڵەکەدا، یان ئەوەی باوك چۆن بیر دەکاتەوە دەبێ منداڵەکەش یان کوڕەکەش بەهەمان شێوەی ئەو بیر بکاتەوە.

ئەمەش بە یەکێك لە دیاردە نەرێنییەکان دادەنرێ لە چەوسانەوەی سیاسیدا لە ناوچەکە، ئەمەش وا لە باوك دەکات دەست بگرێ و پارێزگاری بکات لە باوەڕە سیاسییەکانی تاکەکانی خێزانەکەی و، لەماوەی بەرەوپێشچوونی تەمەنی و یاخود گەیشتن بە تەمەنی قوتابخانە لەوێشەوە دەست بە قۆناغی دووەم دەکری لە هۆشاری سیاسی.[78]

## ٢. دامەزراوە پەروەردەیی و ئەکادیمییەکان:

قوتابخانە بە هۆکارێکیتر دادەنرێ لە هۆکارەکانی گەشەکردنی سیاسی کە مانای دەستکەوتنی هۆشیاری سیاسی دەدات و، ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە گەشەکردنی ڕەفتاری سیاسی تاك دوای (خێزان) دێ. قوتابخانە ڕۆڵ دەبینێ لەڕێگەی شێوازی فکرەکان و ئاراستەکانی کە لە کۆمەڵگا هەیە، لەڕێگەی هۆکارو ئامرازە دیارو ناسراوەکان.

زانایەکی سیاسی ئەمریکی ناوی (ماریام) جەخت لەرۆلی قوتابخانە دەکاتەوە بەوپێیەی ڕۆڵی ڕەسمی هەیە قوتابخانەیەك نیزامێکی پەروەردەیی و

---

٧٨ د.أحسان محمد شفيق العاني،الملامح العامه لعلم الاجتماع السياسي،بغداد،مطبعة جامعة بغداد.١٩٩٨، ص ١٢٧

رەسمی هەیە کەهەڵدەستیّ بەکاری پەروەردەی مەدەنی و، قوتابییەکانیش یەکەم کاری گەشەکردن وهۆشیاری لەرێگەی قوتابخانە دەستیان دەکەویّ.

قوتابخانە هەستی تاکەکان قووڵ دەکاتەوەو ئینتمایان بۆ کۆمەڵگا دروست دەکات و، بەشداری دەکات لەبنیاتنانی کەسایەتی منداڵ و رۆشنبیریکردنی لەرێگەی تێگەیاندنی کەلەپورو عادەت و دەیکاتە نوێنەرێکی بەشدار لەکۆمەڵگاداو، پەیرەوی خوێندن و کادیری زانستی و قوتابییەکان و شوێنەواریان دیارە لە دەستکەوتنی هۆشیاری سیاسی و، ئێمە لە قەیرانی دواکەوتوویی پەیرەوی خوێندنداین، ئەمە جگە لەدواکەوتویی کادیرە زانستییەکان لەرووی فکری رۆشنبیریانەوە.[79]

زانکۆ گرنگترین دامەزاوەیە بۆ بەرهەمهێنانی کادیرو بیرمەندو پەرەپێدانیان و، کاریگەری هەیە لە کۆمەڵگاو وڵاتە پێشکەوتوەکان لەرێگەی بەشداریکردنی زانکۆکان لە دروستکردن یان بڕیاردانی سیاسی بۆ کۆمەڵگاو، هەمیشە زانکۆکان لە جێگەی هێزی فشار بوونە لەسەر حکومەت، زانکۆ رۆڵی ئەرێنی خۆی دەگێڕیّ لە بەستنەوە لەنێوان زانین و بەرهەم، یان بەستنەوەی زانکۆ بە کێشەکانی کۆمەڵگاو، کارکردن لەسەر رۆشنبیری کردنی خەڵك و دانانی پلان و بەرنامەی کارپێکراوو بنکە لێکۆڵینەوەکان کە کار دەکات لەسەر زیادکردنی هۆشیاری سیاسی و، بڵاوکردنەوەی لەنێوان قوتابیان و خەڵك و کۆمەڵگاو، رۆڵی زانکۆ لە دەستکەوتنی هۆشیاری سیاسی دیار دەکەویّ لە رێچکەی گرنگیدانی زانکۆ بە رووداوەکان و باروددۆخی سیاسی کە کۆمەڵگە پیایدا تێپەڕ دەبیّ، بەتایبەتی لە زانستی مرۆڤایەتی و، نموونە هەیە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە رۆڵی زانکۆ لە هۆشیاری سیاسی وکاری سیاسی، نابیّ زانکۆ جیا بکرێتەوە لە کۆمەڵگا، بەڵکو دەبیّ ببەسترێتەوە بە کۆمەڵگاوە ئەو کێشانە بزانیّ کە روو دەدەن لە کۆمەڵگاو هەموو هەوڵێك بدات بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ ئەو کێشانە.[80]

ئەمانە سەبارەت بە دامەزراوە یەکەمیەکان یان سەرەتاییەکان بوون و رۆڵیان لە دەستکەوتی هۆشیاری سیاسی، دامەزراوەی تری بنەڕەتی هەیە

---

٧٩ د.أحمد جمال ظاهر، دراسات الفلسفة السياسية، عمان، دارالكندي، ١٩٨٨، ص ٤١٢.

٨٠ يرڤان سليمان البرواري، الوعي السياسي وتطبيقاته، دهوك، مطبعة هاوار، ٢٠٠٦، ص ٣٨.

کــەرۆڵیان هەیــە لــە دەســتکەوتنی هۆشــیاری وەك پارتــە سیاســییەکان، کۆمەڵەکانی فشارو ئامرازەکانی ڕاگەیاندن.

### ٣. حزبە سیاسییەکان:

پارتە سیاسییەکان ڕۆڵێکی گرنگیان لە ئاراستە سیاسییەکان بۆ تاك هەیە، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ڕۆڵی پارتەکان وەك ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و.... هتد، لەگەڵ گۆڕانی کۆمەڵگە یان جیاوازی کۆمەڵگاکان گۆڕانکاری بەسەردا دێ و لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکیتر دەگۆڕێ و لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکان جیاواز دەبێ، ژیانی تاکەکان بە ڕادەیەکی زۆر بە پارتەکان بەستراوەتەوە، بەڵام لە کۆمەڵگەی تردا ئەمە بەدی ناکرێ، لە کۆمەڵگەی ئەمریکی بە نموونە، پارتەکان ڕۆڵێکی زۆر ناگێڕن ئەمەش بۆ ئاستی هۆشیاری سیاسی تاکی ئەمریکی دەگەڕێتەوە، (پێت سەیر نەبێ ئەگەر لە وادەیەکی کەم کۆماریی بگۆڕدرێ بۆ دیموکراتی یان بەپێچەوانەوە، ئەم گۆڕانکارییەش نابێتە هۆی تێکچوونی بارودۆخ وەك لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا دەبینرێ).[٨١]

زۆرجار پارتە سیاسییەکان وەك ئامرازێك وان بۆ هۆشیاری سیاسی لە ماوەی سەرەتاکانی گەشەکردنی سیاسیدا، لە کۆمەڵگا پێشکەتووەکاندا ڕۆڵی پارتەکان وەك سێبەرێك وان بۆ هۆشیاری سیاسی و زۆرجار ئاراستەکانی پارتە سیاسییەکان لە وڵاتە پێشکەووتوەکان بەستراوەتەوە بەو بنەمایانەی لە خێزان و قوتابخانە فێر دەکرێن، بەڵام لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا پارتەکان ڕۆڵیان کەمترە، چونکە ئەو بنەمایانە دادەڕێژێ کە زۆرجار جیاوازی نییە لەگەڵ ئەو بنەما سیاسیانەی گەورەکان لە منداڵییەوە فێری دەبن، هەروەها لەو کۆمەڵگایانەدا پێشکەوتن و گۆڕانکاری کورت کراوەتەوە لە پارتە سیاسییەکان.[٨٢]

---

٨١ زیرفان سلیمان، **الانتخابات الأمریکیة، وعقدة العراق، جریدة الافق، العدد ٦٠، ٦.١٧، ٢٠٠٤، عن طریق شبکة الانترنیت:** www.kurdiu.org.

٨٢ د.سامان الغزالي، **الاحزاب السیاسیة فی العالم الثالث، الکویت، عالم المعرفة، ص ١٨٢.**

له رژێمە نوێیەکان دامەزرراوو دەزگای تر هەڵدەستن بە رۆڵی هۆشیاری، بەلاّم پارتەکان بەرپرسیاریتی گرێبەستی کۆمەلاّیەتی و رێکخستنی بۆنەی سەربەخۆی و جەژنی لەدایکبوونەکان بۆ سەرکردە نەتەوەییەکان دەگرنە ئەستۆ.[٨٣]

پارتەکان لەناوچەکانی رۆژهەلاّتی ناوەراست رۆڵێکی دیار دەبینێت لە رووداوە سیاسییەکان و تێگەیشتن لێیان، لە بەرئەوەی ئەم کۆمەڵگایانە بە کۆمەڵگا دەستەییەکان دادەنرێن لەبەر ئەوەی دەستەیەکی حکومدار هەریەك لە کۆمەڵگا ئاراستە دەکات بەرەو تێگەیشتنێکی دیاریکراو شێوازێکی دیاریکراو لە دەسەلاّت. شیکردنەوەی دیاریکراو بۆ کێشە سیاسییەکان کە روودەدەن لە چوارچێوەی ناوخۆو نێودەوڵەتی، بۆیە ئەم رۆڵەی پارتەکان تا رادەیەك بەرۆڵێکی نەرێنی ئەم بارودۆخە دەبێتە هۆی دەست خستنەسەر بیرکردنەوەکان لەکۆمەڵگا. هەر چۆنێك بێت پارتەکان رۆڵێکی دیاریان هەیە و لەهەندێ بواردا رۆڵێکی یارمەتیدەرن بۆ دەستکەوتنی هۆشیاری سیاسی و بێگومان ئەمەش بەپێی پارتەکەو کۆمەڵگایەکە دەگۆرێت.[٨٤]

## ب- گرووپەکانی فشار:

دامەزراوەیەکی ترە کە بەشداری دەکات لە دەسکەوتنی هۆشیاری سیاسی لەو کێشانەی کە لە ژینگەی کۆمەلاّیەتی مرۆڤدا هەن، ئەم کۆمەڵەیە فشار دەکەن و هۆشیاری بلاّو دەکەنەوە سەبارەت بە کێشەیەکی دیاریکراو، زۆرجار ئاراستەیەکی دیارکراو زۆرجار ئەو کێشەیە یان ئاراستەیە یەك ناگرنەوە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی تاك ئەوانەی کۆمەڵەی فشار پێکدەهێنن. کۆمەڵەی فشارهێنەکان دیاردەیەکی کۆنە، بەلاّم بەشێوەیەکی باش لە کیانی سیاسی دەرنەکەوتووە، تەنیا بۆ ماوەی چەندساڵێك نەبێ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەرکەوتووەو دواتر لە ولاّتانیتر بلاّوبۆتەوە.[٨٥]

---

٨٣ د. صادق الاسود، مصدر سابق، ل ٢٧٦.

**٨٤ د.سامان الغزالي حرب**، مصدر سابق ص ١٨٤

٨٥ د. صادق الاسود، مصدر سابق، ل ٢٧٨.

ئـەم کۆمەڵەیـە، کۆمەڵـە کەسـێکن چـەند وابەسـتەیەك و پەیوەنـدی تایبـەتی و سـیفاتی هاوبـەش پێکـەوەیان دەبەسـتێتەوە، ئـەوەش لەسـەر نوێنـەرانی فـەرز دەکات رەفتاری هاوبەشیان هـەبێ و رێگـای وایـان هەیـە وا دەکـات ئـەو کۆمەڵەیـە هۆشیاری سیاسـی دەسـت دەکـەوێ، کـە بـەدیار دەکـەوێت لەڕێگـەی ئـەو وەزیفـەی کە پـێ ی هەڵدەسـتێ ئـەم کۆمەڵەیـە کاریگـەری راسـتەوخۆو ناڕاسـتەوخۆیان هەیـە لـە حکومـەت، ئـەوەش دەبێتـە هـۆی فـەرزکردنی جـۆرە رەفتارێـك و هۆشـیاری سیاسـییەکە لەسـەر تاکـان ئەوانـەی کـە ئینتمـای ئـەم کۆمەڵـەیان هەیـە و، کاریگـەری راسـتەوخۆی ئـەم کۆمەڵەیـە لەڕێگـەی نـاردنی شـاندێك بـۆ حکومـەت بڕیاری خۆی دەردەکات سەبارەت بە کێشە سیاسیە جۆراوجۆرەکان.

رۆڵ و کاریگـەری کۆمەڵـەی فشـار لەسـەر دروسـتکردنی هۆشـیاری سیاسـی لـە کۆمەڵگەیەکـەوە بـۆ کۆمەڵگەیـەکیتر جیـاوازە، بـە هـەمان شـێوازی پارتـە سیاسـییەکان، بـۆ نموونـە دەبیـنین ئـەو رۆڵـەی ئـەم کۆمەڵەیـە هەیـەتی لـە وڵاتـە ئەوروپیـەکان و رۆژئاواییـەکان بەتایبـەتی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا زۆرجـار رۆڵێکـی مـەدەنی هەیـە لەڕێگـەی فـەرزکردنی هەنـدێ لـە ئیلتزامـاتی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و ئـابووری لەسـەر حکومەتـەکان لـە رێگـەی کۆمپانیـاو دامـەزراوە راگەیاندنـەکان و سـەندیکاکانەوە، بـەڵام لـە وڵاتـانی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت رۆڵـی ئـەم کۆمەڵانـە هێشـتا روون و ناشـکرا نییـە و ئـەم کۆمەڵانـە کـورت دەکرانـەوە یـاخود بـریتین لـە سـەرۆك خێـڵ یـان ئەوانـەی ناویـان بـە شـێخ هـاتووە. رۆڵـی کۆمەڵـەی فشـارو کاریگـەرییان لەسـەر هۆشـیاری سیاسـی لـە وڵاتـانی رۆژئـاوا بەسـتراوەتەوە بـەو رۆڵـەی ئـەو کۆمەڵانـە دەیبیـنن لـە مـاوەی کاریگـەریان بەسـەر هەڵبژاردنـەکان و بـارودۆخی بڕیـاری سیاسـی لـەو وڵاتانـەداو ویلایەتە یەکگرتووەکان وەك نموونەیەکی زیندوو دادنرێ.[٨٦]

٨٦ زیرڤان سلیمان البرواری، مصدر سابق، ل٤٢.

### ٤. ئامرازەکانی ڕاگەیاندن:

ئـامرازی ڕاگەیانـدن و گەیانـدن لـە سـەردەمی ئاسمانییـەکان و تـۆڕە زانیارییـەکانی هەموو جیهـانی داگـیر کـردووە بـە بەرنامـەکان و پیشـاندانەکانی تـا کردنـی جیهـان بـە گونـدێك، کـە خـەلکی باشـوور بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆو خێراییـەکی زۆرەوە سـەیری هەواڵی باکوور دەکـەن، ئەمـە وایکـردووە ئـەم هۆکـارە یارمەتیـدەر بـێ بـۆ سـەیرکردنی فـراوان و خێـرای ڕووداوە سیاسـییەکان و بـارودۆخی وڵاتـان، کـە دەبێتـە جۆرێـك لـە هۆشـیاری سیاسـی، هۆشـیاری سیاسـی هـەموو میللـەتێك لـە ڕووداوو کاروبـاری نـاوخۆ بەستراوەتەوە بە سیاسەتی حکومەتەکەیانەوە.

هۆکارەکـانی ڕاگەیانـدن بەوپێیـەی ڕێگایەکـە بـۆ دەسـتکەوتنی هۆشـیاری سیاسـی جۆراوجـۆرن واتـە هۆکارەکـانی ڕاگەیانـدن جۆراوجـۆرن بـەپێی جیـاوازی و جـۆری سەرچـاوەی ئـەو ئـامرازو هۆکارانـە، لـەناو ڕژێمـە یـاخود سیسـتمە شموولییـەکان هـەموو هۆکـارە ڕاگەیاندنـەکان بـە دەسـتی حزبـی دەسـەڵاتەوەیە کـە توانـای خـۆی چـڕ دەکاتـەوە لەسـەر بیرکردنـەوەی گشـتی، ئەمـەش پێچـەوانەی ئەوەیـە کـە دەیبیـنین لـە وڵاتـە دیموکراتییـەکان، کـەوا هۆکارەکـانی ڕاگەیانـدن بیروڕای خۆی و توانای خۆی فەرز دەکات بەسەر حکومەت و سیاسەتەکەی.

(تـودجتلن) ئامـاژە بـەوە دەکـات کـە تایبەتمەنـدی یـان خاسیەتەکانی هۆکـاری ڕاگەیانـدن سـەبارەت بـە بزووتنـەوە کۆمەڵایەتییـەکان، ئەوانـەی بانگەشـەی گـۆڕانی ڕیشەیی دەکەن لە سیاسەت).[٨٧]

بەم شێوەیە ڕاگەیانـدن کاریگـەری دەبـێ بەسـەر تـاکی کۆمـەڵگاو تاکـەکان ئاراسـتە یـاخود ڕێنیشـاندەرو بیروڕایـان دەبـێ لـە بـارەی ڕووداوە سیاسـییەکان، لەبەرئـەوەی لـە سەردەمی زانیاریدا دەژیـن، بۆیـە ئـەم ڕۆڵـە دیـار دەکـەوێ لـە پێشـکەوتنی هۆشـیاری سیاسـی دەبینـرێ، بـەڵام چـۆنیەتی گەیشـتن بەمـە یـان سیسـتمە شمولیـەکان دەبینـرێ

٨٧ دوریس اية جربر، سلطة وسائط الاعلام في السياسة، ت: د. أ سعد أبو ليده، عمان، دار النشر والتوزيع، ط٢، ٢٠٠٠، ص ٢٧٧.

کەوا وشەیەك دەستگیر دەکرێ و بیروڕاش لە سێدارە دەدرێ و ڕاگەیاندن ئاراستە کراوە تا ئەو رادەیەی مەبەستە، بۆیە هەر دیاردەیەکی هۆشیاری سیاسی لێرەدا سەرهەڵبدات ساختەیە یاخود ئاراستەکراوە. لەئێستادا ڕاگەیاندن ڕۆڵێکی گەورەتر دەگێڕێ، لەرێگەی زۆری هۆکارەکانی ڕاگەیاندن وەك تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی و گۆڕانی جیهان بۆ گوندێکی بچووك، بۆیە تاك ئەوانەی لەژێر دەست و چەوسانەوە دەژین دەتوانین شارەزای جیهانی فراوان و بیرکردنەوەی ئازاد بن لەرێگەی ئەنتەرنێت و مانگە دەستکردکان.

جیاوازی لەنێوان کاریگەری هۆکاری ڕاگەیاندن لە دەستکەوتی هۆشیاری سیاسی هەیە، ڕاگەیاندنی جیهانی ئەمڕۆ کاریگەرییەکی دیاری هەیە لەسەر بیرکردنەوەی میللەت، ئەمەش بەهۆی خێرایی گواستنەوەی زانیاری لە نێوان رۆژهەلات و رۆژئاواو باکوورو باشوور ئەم کاریگەرییەش لە کۆمەڵگا گۆشەگیرو داخراوەکان بە هێز بڵاو دەبێتەوە، بەڵام ڕاگەیاندنی ناوخۆیی کاریگەری تا ئاستی داواکراو نییە و، کاری لە هۆشیارکردنەوەی تاك و هۆشیارکردنەوەی سیاسی بەندە بەو بیروڕایەی دەسەڵاتدار دەیەوێ بیگەیەنێتە شەقام، بەمانایەکیتر فەرزکردنی هێزی دیاریکراو لەسەر شەقام، لەپێناو بەرژەوەندی دەستەیەکی حاکمدا دەبێ بۆئەوەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی ناوخۆ کاری خۆی بکات و رۆڵی خۆی بگێڕێ، دەبێ تێکەڵاوی دروست بکات لەگەڵ خەمەکانی خەڵك و دەربڕینی ئەوەی شەقام و رای گشتی میللەت دەیانەوێ.[88]

بە درێژایی مێژوو رۆژنامەگەری رۆڵی لە دروستبوونی هۆشیاری بینیوەو، هەمیشە هۆکارێکی سەرەکی بووە لە کاری دروستبوونی سیاسەت و کۆمەڵایەتی و، حکومەتەکان گرنگیان داوە بە رۆڵ یان کاریگەری رۆژنامەگەری لەسەر شەقام، هەموو کاتێك هەوڵیداوە بەشێوەیەك یان زیاتر بتوانێ کۆنترۆڵی ئامرازە ترسناك و گرنگەکان بکات، وەك چۆن پارت و دامەزراوە کۆمەڵە جیاوازیەکانیش هەوڵیان داوە رۆژنامەگەری بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاربێنن و، لەرێگەیەوە هەوڵدەدات هۆشیاری لەناو کۆمەڵگا بڵاو

---

٨٨ زيرڤان سليمان البرواري، مصدر سابق، ص ٤٥.

بکاتەوە. زانایانی پەیوەندیکردن وایدەبینن ئامرازەکانی راگەیاندن لەئێستادا بۆتە ئامرازێکی نایاب بۆ بڵاوکردنەوەو چەسپاندنی بیرۆکە لەناو خەڵکدا، لە سایەی دیموکراتی سەردەمداو، گەورەترین ئامرازی کاریگەرە بۆ کاریگەری خستنە سەر رای گشتی و دروستکردنی کەشێکی سیاسی.[89]

## رۆڵی راگەیاندن لە گەشەکردنی هۆشیاریی سیاسی:

مەبەست لەم باسە رادەی خوێندەواری و ئاستی هۆشیاری تاکەکانە لەرووی توانای خوێندنەوەو شرۆڤەکردن و سەرلەنوێ تەوزیفکردن، تائاستێك زیاتر پەیوەستە بە کەناڵی خوێندراو کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بەوپێیەی رادیۆو تەلەفزیۆن و سەتەلایت و ئینتەرنێت هەن رۆڵەکەی دەبێتە لاوەکی. بەڵام وەنەبێ ئەو هاوکێشە و خوێندنەوەیەمان بۆ هەموو کۆمەڵگاو شوێن و کاتەکان بە راست و دروستی بێت. لەگەڵ ئەوەشدا بەرزی پلەی خوێندەواری و ئاستی هوشیاری و بیرکردنەوەو لێکدانەوەو تاوتوێکردن و هەڵسەنگاندنی رووداو دەرکەوتەکان و شارەزایی لە بەکارهێنان و سوودوەرگرتن لە هۆیەکانی راگەیاندن رۆڵێکی زۆر پڕبایەخ لەم میانەیەدا دەگێڕن.[90]

هەروەها (هارۆلد لاسویل) باسی لەئەرکی راگەیاندن دەکات راگەیاندن پەیامەکانیان بە بینەر یان بیسەر یان خوێنەر کە ئەو ئەرکە بۆ سێ بەش دابەش دەکەن:

١. چاودێریکردنی جیهان، بۆ راپۆرتی بەردەوامی رووداوەکان، لێکدانەوەو شیکردنەوەی رووداوەکان.

٢. پێگەیاندنی تاك لەناو چوارچێوەی رۆشنبیری.

٣. ئەرکی سێیەمیش زیاتر خزمەتکردنە بە کاری پێگەیاندنی سیاسی.

هەموو ئەمانەش هۆکارێکی سەرەکین بۆ هۆشیارکردنەوەی تاکەکان لەکۆمەڵگەدا.[91]

---

٨٩ د.يحيى عمر ريشاوي، مصدر سابق ،ص١٤٥

٩٠ نوری بێخاڵی، سەرچاوەی پیشوو ، ل٢٠.

٩١ د. محمود حسن اسماعيل، التنشئة السياسة، مصر، دارالنشر للجامعات، ١٩٩٧، ل٥٠

ئەگـەر هۆكارەكـانی راگەیانـدن گرنگیدانـەكانمان بـۆ چـەند مەسـەلەیەكی گـرنگ و دیـاریكراو دەبـات و كاریگـەری دەكاتـە سـەر ئـەوەی كـە بـیری لـێ دەكەیتـەوە، كاریگـەری دەكاتـە سـەر دیـاریكردنی مەسـەلەكانیش كـە لـە كاروبـاری سیاسـییە گرنگـەكان دەبـێ و، دەزگاكـانی راگەیانـدن كاریگـەریان لەسـەر گشـتی لەسـەردەمی نوێـدا گەیشـتۆتە رادەیـەكی ترسـناك، لەبەرئـەوەی بەرهەڵسـتكاری سیاسـی گرنگـی زیاتری پـێ دەدات، چونكە رای بەرهەڵسـتكار لـەم رێگەیـەوە دەگاتـە خـەڵك. رۆژنامـە هێزێكە بەشـێوەیەكی كـارا رۆڵ دەبینـێ لـە دروسـتكردنی رووداوەكـان و بـە هۆكـارێكی گرنگ دادەنرێ بـۆ گەیانـدنی ئـەوەی لـە واقیعـدا روودەدات و نـاتوانێ خـۆی لـە راسـتی و دروستی رووداوەكان بدزێتەوە یان خۆی بە لێپرسراو نەزانێ.

رۆژنامە بـەو شـتانەی مەبەسـتیەتی لـە گەیانـدنی دەسـتی هەیـە لـە جوڵانـدن و دیـاریكردنی ئاراسـتەی خـەڵك بـەرەو كێشـەیەكی دیـاریكراوو بۆتـە كاریگـەرێكی گـەورە لەسـەر رووداوەكـان و هێمنكردنـەوەی خـەڵك و پەیوەندییـەكی تونـدوتۆڵ هەیە لەنێوان رۆژنامـە و سیاسـەت كـە زۆر بـە روونـی دیـارە، ئەمـەش لـە رێگـەی ناوهێنـان و نیشـاندانی نـاوی ئـەو سیاسـەتمەدارانەی لـە گۆڕەپـانی كـاری سیاسـیدا دیـارن. زۆرجـار ئـەو سیاسـەتمەدارانە بـەدوای رۆژنامەنووسـان دەنێـرن و پەیوەنـدی هاورێیـەتیان لەگـەڵ دەبەسـتن، زۆربـەی یـان هەنـدێ لـە سیاسـەتمەدارو سـەركردە سیاسـییەكان سـوود لــە پێنووسـی رۆژنامەنوسـان دەبیـنن بـۆ دەرخسـتنی بینینـەكانیان و دەركردنـی فكرەكانیـان، هـەروەها باوەڕپێهێنـانی ئـەوانیتر بـە بەرنامـە سیاسـیەكەی، لێكۆڵـەر "محمـد حمـدان المصـالحة" لـە كتێبەكـەی بـە نـاوی (الاتصـال السیاسـی) وایـدەبینێ، پەیوەنـدی لـەنێوان رۆژنامـە و كـاری دروستكردنی هۆشیاری دروستكردنی بڕیاری سیاسی هەیە.[٩٢]

لەو كاتانەی دەزگاكـانی راگەیانـدن ئـازاد دەتـوانن، بـەئازادی كـار بكـەن دەبنـە پاڵپشتی گـرنگ بـۆ دیموكراسـیەت، چـونكە سـەرباری ئـەوەی دەبنـە چـاودێر بەسـەر حكومەتـەوە بـە كێشـە و پرسـەكانی پەیوەنـدی بـە ژیـان و سـەردەمانەوە ئاگـادار دەكەنـەوە، ئـەو دەزگایانـە یارمەتیـدەرن بۆئـەوەی بـە باشـی لـە حكومەتەكـەیان

---

٩٢ د.یحیی عمر ریشاوی، مصدر سابق ،ص148

بگـەن و بەئاسـانی بیگـەنێ و ئـەو دەزگـاو کەناڵانـە شـانازی دەکـەن کـە ئـەوان بوونەتـە هۆکـاری ئاگـاداریکردنی حکومـەت لـەو پرسـەو بەدەمەوەچـوونی و چارەسەرکردنی، یـان ئاگـادارکردنی هاونیشـتمانیان لـەو زانیارییانـەی کـە بابەتیانـە کەموکورییـەکانی بەرپرسـان و دامودەزگاکـانی حکومـەتی دەخاتـەڕوو، کـە بۆتـە شتێکی ڕۆژانە لە ژیانی هاووڵاتیاندا.[93]

هـەروەها ڕاگەیانـدن کاریگـەری لەسـەر کـاری پێگەیانـدی سیاسـی لەکۆمەڵگـەدا، ئەمـەش دەروازەیـەکی سـەرەکییە بـۆ هۆشـیارکردنەوەی تاکـەکان لـەبارەی لایـەن و ڕووداوە سیاسییەکان، کە لەم لایەنانەوە کاریگەری دەکات ئەوانیش:

١ .دەزگاکانی ڕاگەیانـدن کـار دەکـەن لەسـەر بڵاوکردنـەوەو ڕێکخسـتنی سیاسـی کە هەڵدەستێ بە نوێنەرایەتیکردنی ئەوانیتر.

٢. مەبەسـتی دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن (پەیوەنـدیکردن)، بـۆ پاڵپشـتی و زاڵبـوونی ئاراستەی سیاسی لیستێکی گەورەو پێکهێنان و دروستکردنی ئاڕاستەی نوێ.

٣. ئـەو پەیامانـەی دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن (پەیوەنـدیکردن) ئەیگوازنـەوە، بەتـەواوی پێشوازی لێ ئەکەن و، لەچوارچێوەی ژینگەی کۆمەڵایەتی شی دەکاتەوە.[94]

## کاریگەری ڕاگەیاندن لە پێکهێنانی هۆشیاریی سیاسی:

دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن کاریگـەری هەیـە لەسـەر گەشـەکردنی سیاسـی و پێگەیانـدنی سیاسـی لـەلای هـەموو تاکـەکان بـە گـەورەو بچـوکەوەو، هاوڕێیـەتی تاکـەکان دەکـات لەسـەرەتای تەمەنیـەوە لـە نزیکـەی سـێ ساڵیەوە تـا کۆتـایی تەمـەن، ئەمـە بەپێچـەوانەی ئامرازەکـانی تـری پێگەیانـدنی سیاسـی کـە دەوری گـەورەی هەیـە لـە قۆناغـەکانی گـەورە بـوون و گەشـەکردنی تـاك، خێـزان دەوری هەیە لە قۆنـاغی منداڵیـدا پـێش گەشـەکردنی شـارەزایی جـۆراو جـۆرو دەوڵەمەنـدو ڕاکێشـانی تاکەکانـە بـە گـەورەو بچـوکەوە، ئەمـەو قوتابخانـەش هۆشـیاری دەداتـە منـداڵ لەسـەرەتای سـاڵی شەشـەمیەوە، حـزبیش تـاك ڕادەکێشـێ لەسـەرەتای

٩٣ ئەورەس ڕەشید، ڕاگەیاندنی ئازادو بەرپرس، هەولێر،چاپخانەی دیار نیە، ٢٠١٠، ل٣٢.

٩٤ د.محمود حسن اسماعیل، مصدر سابق، ل ٤٦_ ٤٧.

قۆنــاغی گــەنجێتی، هــەروەها گرنگــی دەزگاکــانی راگەیانــدن لــە پێگەیانــدنی سیاسی لــە مــاوەی پێشکەشــکردنی شــارەزایی جــۆراو جــۆرو دەوڵەمەنــدو راکێشــانی تاکەکانــدا بەگــەورەو بچــوکەوەو، ئــەم کاریگــەری راگەیاندنــە بەســەر پێگەیانــدنی سیاسی تاکەکانەوە دەبێتە دەروازەیەك بۆ هۆشیاری سیاسیان.[٩٥]

ناتوانین پێــداگیری کاریگــەری ئامرازەکــانی راگەیانــدن بکــەن لــە پێکهێنــانی هۆشــیاری سیاســیدا، کــە زۆربــەی تاکــەکان یــان گــەنجان ئــالودە بــوون بــە چــاودێرکردنی رووداوە سیاســییەکان لەســەر ئاســتی هــەرێمی و نێودەوڵــەتی، لــەپێناو زانینــی رووداوە شــاراوەو نادیارەکان، ئــەم دەزگایانــە کاریگــەریان لەســەر دروســتبوونی رای گشــتی و وێنــەی شــێوەی رەفتاری خــەڵك هەیــە و، زاڵ بــێ بەســەر خــودی خۆیــان و مێشــك یــان پێویســتە پاڵپشــتی دەزگاکــانی راگەیانــدن بکــرێ لەرێگــەی لێکۆڵینــەوەو توێژینــەوەی چــروپڕو ئــاڵوگۆڕکردنی سروشــتی ژیــان و یارمەتیــدانی بــە هەوڵــە جــۆراو جۆرەکــانی دامــەزراوەکانی کۆمــەڵگای نــاوخۆی و نێودەوڵــەتی و گەیاندنــەوەی متمانــە لــەنێوان هۆیــەکانی راگەیانــدن و گــەنجان پێویســتە، لــە رێگــەی پەیوەندییــە نــاوخۆی و سیاســی و کۆمەڵایەتیــەکان و، پێویســتە دەزگاکــانی راگەیانــدن هەســتن بــە کــاری رۆشــنبیرییە جیاوازەکــان و بــیرو بۆچــوونە جۆراجۆرەکان لە دروســتکردنی هۆشــیاری سیاســی و بــەهێزکردنی دڵســۆزییان بــۆ نیشــتمان و دژایەتیکردنی ئەوانەی ئەبنە هۆی جیاوازی و شکاندنیان.[٩٦]

رۆڵــی راگەیانــدن جــا شــێوەکەی هــەر چــۆنێك بێــت لــە کاریگەریکردنــە ســەر دروســتکردنی بڕیــار، ئەمــە رێــك دەگــونجێ لەگــەڵ ئازادییەکــەی لــە گواســتنەوەی هەواڵ لەسەر رووداوە ناوخۆییەکان کە بۆ وڵاتێك یان زیاتر بایەخدارە.

- رۆژنامــە دەتــوانێ دروســتکەری بڕیــار ئاراســتە بکــات بــەرەو بڕیارەکــان ســەبارەت بــە رووداوی دەرەوە، وەك چــۆن لــە پێگەیانــدنی فکــرو بیرکردنــەوەیان ســەبارەت بــەو رووداوانــە یارمەتیــدەرە، هــەروەها لــە دروســتکردنی ئــەو بڕیــارەی بەشدارە کە دەدرێ.

---

٩٥ المصدرنفسه،ص٥٥

٩٦ ندا دليغ،دور وسائل الاعلام في تكوين الوعي السياسي، بدون مكان، بدون دار نشر، ٢٠٠٩، ص ٩٣

- رۆژنامە یارمەتیدەری گواستنەوەی هەواڵە، گواستنەوەی پێشهاتەکان و کاردانەوەکان لەسەر ئەم هەواڵە، لە هەموو دونیادا وا لە بڕیار دەکات بەخێرایی بزانێ لەم جیهانە چی روودەدات.
- رای گشتی ناوخۆ کاریگەری هەیە بەسەر بڕیاردەر، ئەمەش لە رێگەی راو بۆچوونیان سەبارەت بە رووداوەکانی دەرەوە کە لە ژینگەی رۆژنامەوە دەردەکەوێ.

رۆژنامە هۆکارێکی راستەوخۆیە کە لە رێگەیەوە هێزە سیاسییەکان دەتوانن زانیاری بەدەست بهێنن سەبارەت بە سیاسەتی حکومەت.[97]

هەروەها ئامرازەکانی راگەیاندن لەبۆشاییدا دەسوورێنەوە ئامانج لە دامەزراندنیان دروستکردنی کاریگەرییە، ئەگەر ئامرازەکانی راگەیاندن نەتوانن کاریگەری دروست بکات، پاش ماوەیەك بونیات نامێنێ و دەتوێنەوە، پاشتر تەنها دەبنە دیکۆرو کۆمپانیا، بۆ هەودەو مەسەلەی کاریگەری دەزگاکانی راگەیاندن لەسەر جەماوەر پانتاییەکی، لە نووسینە ئەکادیمییەکان و توێژینەوەکانی بواری راگەیاندندا داگیر کردووەو، زانایان هەر لەسەرەتای پەیدابوونی ئامرازەکانی راگەیاندن لە رادەی کاریگەری ئەم ئامرازانە لەکۆمەڵگەدا دەکۆڵنەوە، کە زۆربەیان پێیانوایە ئامرازەکانی راگەیاندن کاریگەری خێرای هەیە لەسەر جەماوەر، پێشیانوایە لەپاڵ ئەمانەشدا دەزگا کۆمەڵایەتییەکان و کلتورو پاشخانی فکری رۆڵ دەبینن.[98]

---

٩٧ د.يحيى عمر ريشاوى، مصدر سابق، ص١٤٩.

٩٨ د.یەحیا عومەر رێشاوی، رۆڵی میدیا لە پێکهێنانی هۆشیاریدا، گۆڤاری رۆژنامەنووس، ژمارە ٢٢، هەولێر، پاییزی ٢٠١٠، ل٦٣.

## کۆکردنـــــەوەی زانیارییـــــەکان لەڕێگـــــەی فـــــۆڕمی ڕاپرسییەوە:

لەم توێژینەوەیەدا فۆڕمی ڕاپرسی بەکارهێنراوە بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان سەبارەت بە لێکۆڵینەوە تیۆری و مەیدانییەکەیان. فۆڕمی ڕاپرسیش لە باوترین کەرەستەی کۆکردنەوەی داتاکانە، بەتایبەتی لە لێکۆڵینەوە ڕووپێوییەکاندا. پرسیارنامە ئەو کەرەستەیەیە کە زانیاری و داتای ڕێکخراو و چەندێتی ئامادە دەکات، بەبێ ئامادەیی لێکۆڵەر کاری خۆی دەکات و، ڕاڤەی ئاماری ورد دەرەخسێنێ. پرسیارنامە کۆمەڵە ڕستە یان پرسیارێکە کە وەڵامدەرەوە وەڵامی پێویستییان دەداتەوە. فۆڕمی ڕاپرسیش بریتییە لەو کۆمەڵە پرسیارەی ئەندامانی نموونەکە بەبێ یارمەتی توێژەر وەڵامی دەدەنەوە.[99]

پرسیارنامەکەمان لە (٢٨) پرسیار پێکهاتبوو:

*ڕەگەزی نموونەی توێژینەوەکەشمان لە نێر و مێ پێکدێ، لەسەر ئاستی ماموستایانی کۆلێژی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەدین.

### خشتەی ژمارە (١)

**ڕەگەزی نموونەی توێژینەوەکە دەردەخات**

| ژمارە | ڕەگەز | ژمارە | ڕێژەی سەدی | پلە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | نێر | ٣٠ | ٪٦٨ | یەکەم |
| ٢ | مێ | ١٤ | ٪٣٢ | دووەم |
| | کۆی گشتی | ٤٤ | ٪١٠٠ | |

---

[99] د. احسان محمد الحسن و د. عبد المنعم الحسني، مصدر سابق ، ل٢٥٢.

لە خشتەی ژمارە (١)دا، کە ڕەگەزی نموونەی توێژینەوەکەمان بۆ دەردەخات، بۆمان دەردەکەوێ ڕێژەی (٦٨٪)ی تاکەکانی دەستنیشان کراوەکان نموونەی توێژینەوەکەمان ڕەگەزی (نێر) پێکدێنێ لەپلەی یەکەمدایە، لەبەرامبەردا ڕێژەی (٣٢٪)ی نموونە دەستنیشانکراوەکان ڕەگەزی (مێ) پێکدێنێ لە پلەی دووەمدایە.

## خشتەی ژمارە (٢)

**تەمەنی نموونەی توێژینەوەکە دەردەخات**

| ژمارە | تەمەن | ژمارە | ڕێژەی سەدی | پلە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ٢٥ ـ ٣٥ | ١٩ | ٤٣٪ | یەکەم |
| ٢ | ٣٦ ـ ٤٥ | ١٠ | ٢٢٪ | دووەم |
| ٣ | ٤٦ ـ ٥٥ | ٨ | ١٨٪ | سێ یەم |
| ٤ | ٥٦ ـ ٦٥ | ٧ | ١٦٪ | چوارەم |
| | کۆی گشتی | ٤٤ | ١٠٠٪ | |

لە خشتەی ژمارە (٢)دا، تەمەنی نموونەی توێژینەوەکەمان بۆ دەردەخات، دەردەکەوێ کە ڕێژەی (٤٣٪) لە دەستنیشانکراوان تەمەنیان لەنێوان (٢٥-٣٥) ساڵیدایە بە پلەی یەکەم دێ. ڕێژەی (٢٢٪)یان تەمەنیان لەنێوان (٣٦-٤٥) ساڵیدایە بە پلەی دووەم دێ. ڕێژەی (١٨٪)یان تەمەنیان لەنێوان (٤٦-٥٥) ساڵیدایە بە پلەی سێ دێ. ڕێژەی (١٦٪)یشیان تەمەنیان لەنێوان (٥٦-٦٥) ساڵیدایە بە پلەی چوارەم دێ.

## خشتەی ژمارە (٣)

**بڕوانامەی نموونەی توێژینەوەکە روون دەکاتەوە**

| ژمارە | بڕوانامە | ژمارە | ڕێژەی سەدی | پلە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | دکتورا | ٢٧ | 61% | یەکەم |
| ٢ | ماستەر | ١٧ | ٪٣٩ | دووەم |
| | کۆی گشتی | ٤٤ | ٪١٠٠ | |

لە خشتەی ژمارە (٣)دا، بڕوانامەی نموونەی توێژینەوەکە روون دەکاتەوە، دەردەکەوێ کە ڕێژەی (٪٦١)ی دەستنیشانکراوان بڕوانامەی دکتورایان هەیە بە پلەی یەکەم دێ و، ڕێژەی (٪٣٩)یان بڕوانامەی ماستەریان هەیە بە پلەی دووەم دێن.

## خشتەی ژمارە (٤)

**نازناوی زانستی نموونەی توێژینەوەکە بۆ دەردەخات**

| ژمارە | نازناوی زانستی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | پلە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مامۆستای یاریدەدەر | ١٧ | ٪٣٩ | یەکەم |
| ٢ | مامۆستا | ١٦ | ٪٣٦ | دووەم |
| ٣ | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | ٦ | ٪١٤ | سێ یەم |
| ٤ | پرۆفیسۆر | ٥ | ٪١١ | چوارەم |
| | کۆی گشتی | ٤٤ | ٪١٠٠ | |

مەبەستمان ئەو نازناوە زانستییەیە کە نموونەی توێژینەوەکە تێیدا بڕوانامەی وەرگرتووە، ڕێژەی (٪٣٩)ی دەستنیشانکراوان مامۆستای یاریدەدەرن و لە پلەی یەکەم دێ. ڕێژەی (٪٣٦)یان نازناوی

## خشتەی (٥)

**رادەی بایەخدان بە بابەتی سیاسی لە دەزگاکانی راگەیاندن**

| ژمارە | رادەی بایەخدان | ژمارە | رێژەی سەدی | پلە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | هەموو کاتێك | ١٤ | ٣٢٪ | یەکەم |
| ٢ | هەندێ کات | ١٤ | ٣٢٪ | یەکەم |
| ٣ | زۆر کات | ١١ | ٢٥٪ | دووەم |
| ٤ | کەم کات | ٤ | ٩٪ | سێ یەم |
| ٥ | نەخێر | ١ | ٢٪ | چوارەم |
| | کۆی گشتی | ٤٤ | ١٠٠٪ | |

لە خشتەی ژمارە (٥) رادەی بایەخدان بە بابەتی سیاسی لە دەزگاکانی راگەیاندن نموونەکە روون دەکاتەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە (٣٢٪)ی دەستنیشانکراوان (هەموو کاتێك) بایەخ دەدەن بە بابەتی سیاسی لە دەزگاکانی راگەیاندن بە پلەی یەکەم دێ. بەڵام (٣٢٪)یان (هەندێ کات) بایەخ دەدەن بە بابەتی سیاسی لە دەزگاکانی راگەیاندن بە پلەی یەکەم دێ. لەبەرامبەردا (٢٥٪)یان (زۆر کات) بایەخ دەدەن بە بابەتی سیاسی لە دەزگاکانی راگەیاندن بە پلەی دووەم دێ. بەڵام (٩٪)یان (کەم کات) بایەخ دەدەن بە بابەتی سیاسی لە دەزگاکانی راگەیاندن بە پلەی سێیەم دێت بەڵام (٢٪)ی دەستنیشانکراوان (کەم کات) بایەخ دەدەن بە بابەتی سیاسی لە دەزگاکانی راگەیاندن بە پلەی چوارەم دێ.

کەواتە دەزگاکانی راگەیاندنی رۆڵێکی زۆر کاریگەر دەبینن لە بابەتی سیاسی، لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری سیاسی لای مامۆستایانی زانکۆ، لێرەدا دەردەکەوێ دەزگاکانی راگەیاندنی رۆڵی بینیوە لەبڵاوکردنەوەی هۆشیاری سیاسی یاخود بە بابەتی سیاسی.

## خشتەی ژمارە (٦)

**بایەخدانی دەستنیشانکراوان بە ئامرازی راگەیاندن**

| ژمارە | رادەی بایەخدان | ژمارە | رێژەی سەدی | پلە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | تەلەفزیۆن | ٣٥ | ٣٦٪ | یەکەم |
| ٢ | رۆژنامە | ١٩ | ٢٠٪ | دووەم |
| ٣ | رۆژنامەگەری ئەلکترۆنی | ١٩ | ٢٠٪ | دووەم |
| ٤ | گۆڤار | ١٢ | ١٢٪ | سێ یەم |
| ٥ | رادیۆ | ١١ | ١٢٪ | چوارەم |
| | کۆی گشتی | ٩٦ | ١٠٠٪ | |

لە خشتەی ژمارە (٦) رادەی بایەخدان بە ئامرازێکی راگەیاندن نموونەکە روون دەکاتەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە (٢١٪)ی دەستنیشانکراوان بایەخ دەدەن بە (تەلەفزیۆن) بە پلەی یەکەم دێ. بەڵام (٢٠٪)یان بایەخ دەدەن بە (رۆژنامە)، بە هەمان رێژەش بایەخ دەدەن بە (رۆژنامەگەری ئەلکترۆنی) بە پلەی دووەم دێن. لەبەرامبەردا (١٢٪)یان بایەخ دەدەن بە (گۆڤار) بە پلەی سێیەم دووەم هەمان رێژەش بایەخ دەدەن بە(رادیۆ) بە پلەی چوارەم دێ.

کەواتە ئامرازێکی راگەیاندنی رۆڵێکی زۆر کاریگەر دەبینن لە بابەتی سیاسی، لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری سیاسی لای مامۆستایانی زانکۆ، لێرەدا دەردەکەوێ ئامرازێکی راگەیاندنی رۆڵی لەبڵاوکردنەوەی هۆشیاری سیاسی بینیوە.

## خشتەی (٧)

**شێوازی ئەو ژانرانەی دەستنیشانکراون بایەخیان پێ دەدەن**

| ژمارە | شێوازی ژانرەکان | ژمارە | ڕێژەی سەدی | پلە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | هەواڵی ڕاپۆرت | ٢٥ | ٣٥٪ | یەکەم |
| ٢ | چاوپێکەوتن | ١٨ | ٢٥٪ | دووەم |
| ٣ | وتار | ١٠ | ١٤٪ | سێیەم |
| ٤ | بەرنامەی ڕادیۆ | ١٠ | ١٤٪ | سێ یەم |
| ٥ | بەرنامەی تەلەفزیون | ٩ | ١٢٪ | چوارەم |
| | کۆی گشتی | ٧٢ | ١٠٠٪ | |

لە خشتەی ژمارە(٧) شێوازی ئەو ژانرەکان کە بایەخی پێدەدەن لە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن نموونەکە روون دەکاتەوە، دەردەکەوێ کە (٣٥٪)ی دەستنیشانکراوان بایەخ بە ژانری (هەواڵی ڕاپۆرت) دەدەن و بە پلەی یەکەم دێ. لەبەرامبەردا (٢٥٪)یان بایەخ بە ژانری (چاوپێکەوتن) دەدەن لە ئامرازێکی ڕاگەیاندن بە پلەی دووەم دێ. بەڵام (١٤٪)یان بایەخ بی ژانری (وتار) دەدەن بە پلەی سێیەم دێ، بەڵام (١٤٪)یان بایەخ بە ژانری (بەرنامەی ڕادیۆ) دەدەن بە پلەی سێیەم دێ، بەڵام (١٢٪)ی دەستنیشانکراوان بایەخ بەژانری (بەرنامەی تەلەفزیون) دەدەن بە پلەی چوارەم دێ.

کەواتە ژانرەکانی ڕاگەیاندنی ڕۆڵێکی زۆر کاریگەر دەبینن لە بایەخدان بە بابەتی سیاسی، لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری سیاسی لای مامۆستایانی زانکۆ، لێرەدا دەردەکەوێ کە ژانرەکانی ڕاگەیاندنی ڕۆڵی لەبڵاوکردنەوەی هۆشیاری سیاسی بینیوە.

# خشتەی (٨)

**بایەخدانی دەستنیشانکراوان بە باسکردنی بابەتە سیاسییەکان لەگەڵ کەسانیتر**

| ژمارە | رادەی بایەخدان بە بابەتی سیاسی | ژمارە | رێژەی سەدی | پلە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | هەندێ کات | ٢٢ | ٥٠٪ | یەکەم |
| ٢ | زۆر کات | ١٠ | ٢٣٪ | دووەم |
| ٣ | هەموو کاتێك | ٦ | ١٤٪ | سێ یەم |
| ٤ | کەم کات | ٤ | ٩٪ | چوارەم |
| ٥ | نەخێر | ٢ | ٤٪ | پێنجەم |
| | کۆی گشتی | ٤٤ | ١٠٠٪ | |

لە خشتەی ژمارە(٨) لەبارەی رادەی ئەو بابەتە سیاسیانەی کە بایەخیان پێ دەدری لە ئامرازەکانیتر هەوڵدەدەی باسیان بکەی لای کەسانیتر، دەردەکەوێ کە (٥٠٪)ی دەستنیشانکراوان (هەندێ کات) بایەخ بە بابەتی سیاسی دەدەن و بە پلەی یەکەم دێ. لەبەرامبەردا (٢٣٪)یان (زۆر کات) بایەخ بە بابەتی سیاسی دەدەن بە پلەی دووەم دێ. بەڵام (١٤٪)یان (هەموو کاتێك) بایەخ بە بابەتی سیاسی دەدەن بە پلەی سێیەم دێ و، (٩٪)ی دەستنیشانکراوان (کەم کات) بایەخ بە بابەتی سیاسی دەدەن و بە پلەی چوارەم دێ. بەڵام (٤٪)ی دەستنیشانکراوان دەڵێن (نەخێر) بایەخ بە بابەتی سیاسی نادەن بە پلەی پێنچەم دێ.

کەواتە بۆمان دەردەکەوێ دەستنیشانکراوان بە پلەی یەکەم (هەندێ کات) بایەخ بابەتی سیاسی دەدەن.

## خشتەی (٩)

**جۆری ئەو کەسانە کە دەستنیشانکراون بابەتە سیاسییەکان گفتوگۆ دەکەن لەگەڵیان**

| ژمارە | لایەنی گفتوگۆ | ژمارە | ڕێژەی سەدی | پلە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مامۆستاکان | ٢٤ | ٣١٪ | یەکەم |
| ٢ | هاوڕێکانی دەرەوەی زانکۆ | ٢٢ | ٢٨٪ | دووەم |
| ٣ | ئەندامانی خێزانەکەم | ١٧ | ٢٢٪ | سێیەم |
| ٤ | لەگەڵ قوتابیان | ١٥ | ١٩٪ | چوارەم |
| | کۆی گشتی | ٧٨ | ١٠٠ ٪ | |

**لە خشتەی ژمارە(٩) لەگەڵ کێ زیاتر گفتوگۆ دەکەی نموونەکە روون دەکاتەوە، بۆمان دەردەکەوێ (٣١٪)ی دەستنیشانکراوان دەڵێن لەگەڵ (مامۆستاکان) گفتوگۆ دەکەن و بە پلەی یەکەم دێ. بەڵام (٢٨٪)یان دەڵێن لەگەڵ (هاوڕێکانی دەرەوەی زانکۆ) گفتوگۆ دەکەن و بە پلەی دووەم دی. (٢٢٪)یشیان دەڵێن لەگەڵ (ئەندامانی خێزانەکەم) گفتوگۆ دەکەین و بە پلەی سێیەم دێ. لەبەرامبەردا (١٩٪)ی دەستنیشانکراوان دەڵێن (لەگەڵ قوتابیان) گفتوگۆ دەکەن و بە پلەی چوارەم دێ.**

# خشتەی (١٠)

**ڕادەی بەدەستهێنانی بابەتی سیاسی لە هەر ئامرازێکی ڕاگەیاندن ڕوون دەکاتەوە**

| ڕادەی بەدەستهێنانی بابەتی سیاسی / ئامرازەکان | هەموو کاتێك | | زۆر کات | | هەندێ کات | | کەم کات | | نەخێر | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
| تەلەفزیۆن | ١٨ | ٪ ٤٠ | ٨ | ٪٢٢ | ١٠ | ٣٢ ٪ | ٢ | ٪٨ | ١ | ٪٩ |
| ڕادیۆ | ٢ | ٪ ٤ | ٢ | ٪ ٥ | ٧ | ٢٣ ٪ | ٧ | ٢٩ ٪ | ٣ | ٪٢٨ |
| ڕۆژنامە | ١٠ | ٪ ٢٢ | ٩ | ٪ ٢٥ | ٥ | ١٦ ٪ | ٧ | ٢٩ ٪ | ٢ | ٪١٨ |
| گۆڤار | ٤ | ٪ ٩ | ٦ | ٪١٧ | ٥ | ١٦ ٪ | ٤ | ١٧ ٪ | ٣ | ٪٢٧ |
| ئینتەرنێت | ١١ | ٪ ٢٥ | ١١ | ٪٣١ | ٤ | ١٣ ٪ | ٤ | ١٧ ٪ | ٢ | ٪١٨ |
| کۆی گشتی | ٤٥ | ١٠٠ ٪ | ٣٦ | ٪١٠٠ | ٣١ | ١٠ ٪٠ | ٢٤ | ١٠ ٪٠ | ١١ | ١٠٠ ٪ |

لە خشتەی ژمارە (١٠) ڕادەی بەدەستهێنانی بابەتی سیاسی لەهەر ئامرازێکی ڕاگەیاندن ڕوون دەکاتەوە، دەردەکەوێ (٤٠٪)ی دەستنیشانکراوان (هەموو کاتێك) لە تەلەفزیۆن بایەخ بە بابەتی سیاسی دەدەن و، (٢٢٪)یان (زۆر کات) و، (٣٢٪)یان (هەندێ کات)، بەڵام (٨٪)یان (کەم کات) و، (٩٪)یان بایەخ بە بابەتی سیاسی لە

تەلەفزیۆن نادەن. هەروەها دەردەکەوێ (٤٪)ی دەستنیشانکراوان (هەموو کات) لە ڕادیۆ بایەخ بە بابەتی سیاسی دەدەن و، (٥٪)یان (زۆر کات) و، (٢٣٪)یان (هەندێ کات) و، (٢٩٪)یان (کەم کات) و، (٢٨٪)ی دەستنیشانکراوان بایەخ نادەن بە بابەتی سیاسی لە ڕادیۆ.

هەروەها دەردەکەوێ (٢٢٪)ی دەستنیشانکراوەکان (هەموو کات) بایەخ دەدەن بە بابەتی سیاسی لە  ڕۆژنامە و، (٢٥٪)یان (زۆر کات) و، (١٦٪)یان (هەندێ کات) و، (٢٩٪)یان (کەم کات)، بەڵام (١٨٪)ی دەستنیشانکراوان بایەخ دەدەن بە بابەتی سیاسی لە ڕۆژنامە نادەن.

هەروەها دەردەکەوێ (٩٪)ی دەستنیشانکراوان (هەموو کات) بایەخ بە بابەتی سیاسی لە (گۆڤار) دەدەن و، (١٧٪)یان (زۆر کات) و، (١٦٪)یان (هەندێ کات) و، (١٧٪)یان (کەم کات)، بەڵام (٢٧٪)ی دەستنیشانکراوان بایەخ بە بابەتی سیاسی لە (گۆڤار) نادەن.

هەروەها بۆمان دەردەکەوێ (٢٥٪)ی دەستنیشانکراوان (هەموو کات) بایەخ بە بابەتی سیاسی لە (ئینتەرنێت) دەدەن و، (٣١٪)یان (زۆر کات) و، (١٣٪)یان (هەندێ کات) و، (١٧٪)یان (کەم کات)، بەڵام (١٨٪)ی دەستنیشانکراوان بایەخ بە بابەتی سیاسی لەسەر ئینتەرنێت نادەن.

کەواتە بۆمان دەردەکەوێ دەستنیشانکراوان بۆ بەدەستهێنانی بابەتی سیاسی لە هەر ئامرازێك لە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن دەرکەوت، ئامرازەکانی ڕاگەیاندن ڕۆڵی بەرچاویان لە بەدەستهێنانی بابەتی سیاسی هەیە.

